لەبڵاوکراوەکانی گۆڤاری سلێمانی
کەشارەوانیی سلێمانی دەریدەکات
زنجیرە (1)

# شەهیدانی 9 ی حوزەیرانی 1963
# چەند لاپەرەیەکی خوێناوی
# لەخەباتی گەلی کورد

نامیلکەیەکە چەندین نووسین و گێڕانەوەو
وێنەو دیکۆمێنتی لەخۆگرتووە

2002

چاپی یەکەم

# شەهیدانی نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣

## چەند لاپەڕەیەکی خوێناوی لەخەباتی گەلی کورد

ئەم کتێبە کەلەسەر ئەرکی ئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی چاپکراوە، ستافی گۆڤاری (سلێمانی) کۆیان کردووەتەوە، ساغیان کردووەتەوە، بەچاپ-یان گەیاندووە، دیارییەکی بچووکە بۆ بەپێزکردنی خەرمانی مێژووی پڕ لەسەروەریی گەلەکەمان

*سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەین کەلەکتێبەدا هاوکاریان کردووین.*

❖ ناوی کتێب: شەهیدانی نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣

چەند لاپەڕەیەکی خوێناوی لەخەباتی گەلی کورد

❖ لەبڵاوکراوەکانی گۆڤاری سلێمانی کەشارەوانیی سلێمانی دەریدەکات

❖ زنجیرە: (١)

❖ ژمارەی سپاردن (٢٢٩) ساڵی ٢٠٠٢ی وەزارەتی رۆشنبیری

❖ چاپی یەکەم

❖ کاری کۆمپیوتەر: نەوزاد سدیق

❖ بەرگ: جەلیل حسێن

❖ چاپ: چاپخانەو ئۆفسێتی شڤان

❖ تیراژ: (٤٠٠) دانە

## پێرستی بابەتەکان


ئەم کتێبە پێشکەشە..............................(4-6)

بەڵگەنامە دەگمەنەکانی ئەو ....................(7-13)

٩ی حوزەیرانی١٩٦٣، پێشینەو کارەسات...............(14-21)

بۆ ئەوەی شەهیدانی نۆی حوزەیران ...............(22-26)

هەڤاڵ محەمەد چاوشین لاپەڕەکانی...............(27-37)

چەپکە گوڵینەی خەباتی خوێناوی ...............(38-46)

ترسناکترین لاپەڕەی مەرکەساتە...............(47-56)

سێ رۆژ لەقاعەی ٣ی حامیە ...............(57-60)

پەنجا رۆژ لەزیندانەکەی حامیەی...............(61-68)

لاپەڕەیەکی زێڕین و پرشنگداری...............(69-71)

با راستییەکان خۆیان بدوێن ...............(72-74)

هاوسەری شەهیدێکی حوزەیران...............(75-76)

ناوی بەشێک لەشەهیدانی...............(77-84)

ناوی ئەندامەکانی (محکمة الوادی)...............(85-88)

٩ی حوزەیران لەدیوانی شاعیراندا...............(89-108)

پاشکۆی وێنەکان...............(109-129)

سوپاس و پێزانین...............(127)

# ئەم کتێبە پێشکەشە:

*بەگیانی پاکی هەمووئەو شەهیدانەی کەلەو رۆژگارە سەختەدا، سنگیان کرد بەقەڵغان بۆ ئازادیو رزگاری کوردو کوردستان.

*بەهەموو ئەوانەی کەناویان لەناو جەماوەرو لاپەڕەکانی مێژووی پڕ لەکارەساتی کورددا، دەدرەوشێنەوەو تائێستا لەبۆنەکاندا یادیان کراوەتەوە.

*بەهەموو ئەوانەش کەتا ئێستا وننـاوبوونو ئێمە لەم کتێبەدا ناوەکانیانمان زیندووکردوونەتەوە، کەهەر ئەوەندەمان پێکراو لەتواناماندا بوو.

*بەوانەش کەبەداخەوە لەم کتێبەدا هەر بەوننـاوی ماونەتەوە، بەو هیوایەی کەکەسانێکی دڵسۆز، یان رێکخراوەکانی مافی مرۆڤو کۆمەڵو سەنتەرەکانیتر لەمەودوا ناوەکانیان ساغ دەکەنەوە.

*بەکەسوکارو کوڕانو کچانو دایکانو خوشکانی هەموو ئەو شەهیدانەی کەلەمانگی رەشی حوزەیرانی ١٩٦٣دا شەهیدو سەرەونگون کرانو خوێنی گەشیان بوو بەهاندەری بەردەوامی شۆڕشو راپەڕینەکانی جەماوەرو ئەم ئازادیو سەروەرییەی ئەمڕۆی لێکەوتەوە.

*بەو شەهیدانەی کەلەئەنجامی رووخاندنی چەندین گەڕەکی کوردنشینی شاری کەرکوك، کەلەڕۆژی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ بەسەرپەرشتی بەناو سەرەك جەمهوری عیراق عەبدولسەلام محەمەد عارف، خانووبەرەکانیان بەسەر دانیشتواندا کاولو وێرانکردو بەهەزاران خێزانو بنەماڵەیان لەو شارەدا

دەربەدەرکردو بەهەزارانیان زیندانیکرد. بەو هیوایەی لاوانی دڵسۆزی ئەو شارە بەشوێن ناوونیشانی ئەو شەهیدانەدا بگەڕێن و ساغیان بکەنەوە.

*بەو شەهیدانەی کە لەناو بازاڕی شاری کۆیەدا بەستران بەدینگەکانی ناو بازاڕەو بەبەرچاوی کەسوکارو هاووڵاتیانی شارە تێکۆشەرەکەی (کۆ)وە درانە بەر گوللەو ئۆفیان نەکرد.

*بەهەموو ئەو کرێکارو جوتیارو هەژارە گوندنشینەکان کەلەو ڕۆژانەداو لەناکاوو بەبێ ئاگاداری کەوتبوونە ناو ڕەبیە زەرو زەوەندەکانی سەر بەجادەو ڕێگا گشتییەکان، لەپەناو پاسێری ناوشاردا گیریانخوارد بوو، لەخان و ئوتێل و ناوبازاڕەکاندا بەبێ ئاگامابوونەوەو کەوتنەبەر ئەو شاڵاوە بەعسیانی دوژمن بەکوردو بەمرۆڤایەتی و بەئازادی و سەروەریی عیراق.

*پێشکەشە بەهەموو ئەو پیاوە ئازاو کۆڵنەدەرو بەغیرەتانەی کە لەو ڕۆژانەدا بەهەزارانیان لێگیراو زیندانیکران، تەنیا لەبەرئەوەی کوردبوون، بەبێ نان و ئاوو داوودەرمانێك لەتەویلەکانی حامیەی سلێمانیدا ماوەیەکی زۆرمانەوە، کەتەنیا بەجنێودانێك، بەقسەپێکردنێك بەسەرکردەکانی ئەو ڕۆژانەی شۆڕشی کوردستان ئازاددەکران، بەڵام ئەو پیاوانە سەربەرزی و سەروەری گەل و وڵاتەکەیان نەگۆڕییەوە بەزەلیلی و سەرشۆڕی بۆیە لەو زیندانەدا، بەو گەرماو بێ ئاوو خۆراکی و داوودەرمانە مانەوە، تا کاربەدەستانی ئەو ڕۆژگارە لەبەرامبەری هەڵوێستی مەردانەیاندا، بەناچاری سەریان بۆ شۆڕکردن ئازادیان کردن و سەربەرزانە لەو ئەزموونە سەختە سەرکەوتن. کەلەدوایشدا ئەوان، یان ڕۆڵەکانیان و نەوەکانیان درێژەیان بەخەبات و مقاوەمەکردو بڵێسەی شۆڕش و شۆڕشی نوێیان بەرزڕاگرت لەپێناوی ڕۆژێکی ئازادی وەك ئەمڕۆی کوردستان، کەتیایدا حکومەتی کوردستان و دامودەزگا دیموکراتییەکانی بووە بەچەتری پاراستن و سەروەریی و کەرامەتی هەموو کوردێك لەکوردستانداو وەك چیاکانی

نیشتمانەکەمان بەرامبەر بەپیلانەکانی داگیرکەران، بەرەفتار ئەنفالچییەکان، بەدرۆو دەلەسەو تەڵەکەبازی تیرۆریستان، بەرامبەریان راوەستاون و بوون بۆ شوورەیەکی پۆڵاین بۆ شەرەفی کورد، بۆ سەروەریی و نیشتمان و میللەت.

ئەم کتێبە پێشکەشە بەهەموو ئەوانەو هەزار ئافەرین بۆ ئەوان و کەسوکارو میللەتەکەمان.

ئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی

٩/حوزەیرانی/٢٠٠٢

# بەڵگەنامە دەگمەنەکانی
# ئەو ڕۆژگارە سەختەلەڕووداوە
# پڕلەمەینەتییەکانی ٩ی حوزەیران دەدوێن

کارەسات‌و ڕۆژە ڕەشەکانی ئەم میللەتە هێندە زۆرن کەبەهەزاران دیکۆمێنت‌و سەدان کتێب‌و دەیان کاسێت‌و شەریتی سینەمایی دواییان نایە، بەڵام بەداخەوە چەند کارەساتەکان زۆرو گەورەو گرانن، کەچی بەڵگەو دیکۆمێنتەکان کەم‌و دەگمەنن، دیارە ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە، کەلەسەرو هەموویانەوە زاڵبوونی دەستی داگیرکەرانە بەسەر سینگی شەقار شەقاری میللەت‌و سەرکەوتنیانە بەسەر شۆڕش‌و بزووتنەوەو ڕاپەڕینە زۆرەکانی گەلەکەماندا‌و کوشتن‌و زەبروزەنگی زەمانەیە، بەدەست ئەوان‌و نووچدانی خەباتی نەتەوەکەمان، باڵادەستی ئەوان بووە بەسەر ئێمەدا، بۆیە ئەوانی هەمیشە سەرکەوتوو، بەسەر ئێمەی هەمیشە زوڵملێکراودا کارێکی وایکردووە، کەدیکۆمێنت‌و بەڵگەنامەی دوای ئاسەواری ئەو هەموو تاوانانە بکەوێتە دەست ئەوان‌و بیکەن بەشایەتی سەرکەوتنی خۆیان‌و ڕەنجەڕۆیی زۆریش بۆ ئێمە، کەلەمەشدا وەک دەڵێن سەرکەوتووان بۆخۆیان مێژوو دەنووسنەوە.

هەردوور نەڕۆین، ڕۆژی ڕەشی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ مێژوویەکی هێندە دوورنییە کەهیچ پاشماوەیەکی لەدواجێنەمێنێ، کەچی ڕووداوە یەک لەدوای یەکەکانی دوای ئەو مێژووە کەزنجیرەیەک بووە، غەدرو تاوان‌و کۆمەڵکوژی ئەم نەتەوەیەو هەموو ئەو بەڵگەنامانەی خستوتە ژێرگڵەوەو ئەمرۆ شتێکی کەم‌و دەگمەن نەبێ نەیهێشتوتەوە. ئێمە لەو هەموو کوشت‌و کوشتارو زیندانی‌و ماڵوێرانیانەدا تەنیا دوو بەڵگەمان لەهەردوو کتێبەکەی اشۆڕشی ئەیلول لەچەند

بەڵگەنامەیەکی مێژوویدا (١٩٦١-١٩٦٣)و ڕێکخراوە دیموکراسیی و پیشەییەکان لەچەند بەڵگەنامەی مێژوویدا (١٩٥٨-١٩٦٨) لەئامادەکردنی و کۆکردنەوەی شازین هێرش-دا وەرگرتووەو کارەساتەکانی ئەو ڕۆژانەی پێبەسەردەکەینەوە بۆ ئەمڕۆ، دەفەرموو ئەمەش ئەو دوو بەڵگەنامانەی ئەو ڕۆژگارە.

## بەڵگەنامەی ژمارە (٢١)

### ئەم کردەوانە خزمەتی بەرژەوەندی وڵات ناکات

بەخوێنی کاوانیو حەمەئەمین میرخانو مەلا ڕەسوڵ وەگەلێك شەهیدانی قارەمانی کوردستان لەسەر سنگی چیا سەختەکانمان کەبەبۆمبای زۆرداری دابێژراوە نووسراوە (کوردستان یا نەمان) نەتەوەی کورد بەڕابەری پارتە شۆڕشگێڕەکەی-پارتی دیموکراتی کوردستان- و سەرکردە قارەمانەکەی مستەفا بەرزانی سالۆنیوێکی ڕەبەق بەرامبەر تانكو فڕۆکە توانیی قارەمانانە بجەنگێ لەپێناوی مافی نەتەوایەتی ئاساییو دادپەروەرانەی خۆیدا.

ئەم نەتەوە قارەمانە کەخاوەنی لەشکرێکی پڕچەکی بەهێزەو هەڵگری دروشمی پیرۆزی کوردایەتییە هەمیشە کۆڵنەدەرانە لەباریا هەیە لەسەر مافو بیروباوەڕی بەرزی خۆی لەکۆڕی کوشتاردا زەبربەدەستانە هەڵمەت بەرێتو سەرکەوێت وەگیانی ڕۆڵەکانی لەپەرستگای ڕزگاریدا بکا بەقوربانی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەحکومەتی نوێ لەچواردەی ڕەمەزاندا دامەزراوە لەتوانامانا بوو لەو ڕۆژەداو تائێستاش ئەو هەلانەی کەڕێکەوت بۆمان بەکاریبهێنین بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆمان بەڵام لەپێناوی ئەوەی بەئاشتی دان بەحەقەکانمانا بنێن تەقە لەگشت لاوە بەفەرمانی سەرکردایەتی گشتی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان وەستێنرا. وەئەو هەموو دیلانەی

لەسەردەمی قاسمی جانەوەردا گیرابوون لەلایەن لەشکری شۆڕشگێڕەوە بەردران. وەپارتیمان هەنگاوی نا بۆ ڕێك کەوتن لەگەڵ ئەم حکومەتە نوێیەدا بەڕێگەیەکی برایانەو ئاشتیانە لەبەرئەوە دەست کرا بەگفتوگۆکردن دەربارەی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد. وەلەو رۆژەوە کەتەقە وەستێنراوە، وەدەستکراوە بەگفتوگۆکردن لەهیچ لایەکی کوردستانا لەلایەن لەشکری شۆڕشگێڕەوە هیچ کارەساتێك نەقەوماوە کەئەوەندەی تۆسقاڵێك ئاسایش شێوێن بێت کەببێتە هۆی پەیدابوونی کۆسپ لەڕێگای گفتوگۆکردندا. کەچی وەکو سەرنج ئەدەین لەلایەن هەندێك لەکاربەدەستانی گێرەشێوێنی قاسمی و ئەوانەی قین لەدڵن بەرامبەر بەکورد گەلێك کردەوەی ناپەسەندو ناهەموار ڕووئەدات کەهەموو لەو چەشنە کردەوانەن، کەئاسایش بشێوێنن و شیرازەی گفتوگۆ ببچڕێنن و ببن بەهۆی ئەوەی کەڕۆژ بەڕۆژ کورد قینی پتر هەستێت. ئەم جۆرە کردەوانە سەرچاوەیان لەهەر کوێیەکەوە بێت بێ گومانە کەلیخنە، هاندەری ئەم ناپەسەندکارانە هەر کەسێك بێت دوژمنی ئێمەو نەتەوەی عەرەبە ئێمە ئەمانەوێ مەسەلەی دان نان بەمافی کوردا بەڕێگایەکی ئاشتیانە بگەیەنینە ئەنجام وەئەگەر بێت و شەڕبەرپا بێتەوە ئەو کەسانەی ئەبنەهۆی تاوان بارن پەنجەی پەشیمانی ئەگەزن. وەئەو جۆرە کردەوە ناپەسندانەیە کەئەبن بەڕێگە پاکەرەوە بۆ گۆڕانی باری مەسەلەکە لەدەربەندیخان و دوکان و ڕێگای بەینی کەرکوك و سلێمانی جۆرە پشکنینێك دەستپێکراوە کەبوو بەهۆی ئەوی کەلوپەل و کوتاڵ و خواردەمەنی بەدەگمەن بگاتە سلێمانی و دەوروبەری کەئەمە جۆرە گەمارۆدانێکی ئابوری سەختە کەئەبێتەهۆی گرانی و برسێتی وەهەروەها لەکاتی پشکنینیشا سەربازەکانی حکومەت و پاسەوانی نەتەوەیی هەروەك سەردەمی قاسم بەووشەی ناڕەواو ناشرین لەگەڵ ڕێبوارەکانە ئەدوێن وەڕەفتاریان شەڕەنگێزانەو ڕەوشت نزمانەیە.

لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان وەکو باسمان کرد دیلەکانی سوپای عێراقی بەردا کەچی حکومەتی نوێ هێشتا بەهەزاران کورد کەلەسەر کوردستان گیراون بەری نەداون وەهەروەك جاری جاران لەبەندیخانەکانی سەردەمی قاسمدان ئەمەش سەرەڕای ئەوەی لەلایەن حکومەتەوە جموجۆڵ دەستیپێکردوە بۆ گرتنی هەڤاڵانو ئەندامانو لایەن گرانی پارتییە پێشڕەوە نەبەزەکەمان.

وەئەو فەرمانبەرە کوردانەش کەلەسەردەرمی قاسمی دیکتاتۆردا گیرابوون وەدەرکرابوون وەیان دەستیان لەکارکێشابووەوە هیچیان نەخراونەتەوە سەرکاری خۆیان وەلەجاران زیاتر فەرمانبەرانو پۆلیسو سەربازی کورد ئەگوێزنەوە بۆ جنوب ئەمە جگەلەوەی کردەوەیەکی رەگەزپەرستانەیە بەرامبەر بەگەلەکەمان ئەینوێنن بەگشتی وەبەتایبەتی لەگەڵ موچەخۆران. ئەم جۆرە کردەوانە بێگومان بۆتە هۆی نارەزایی هاوولاتیان بەرامبەر بەسیاسەتی حکومەتی نوێ وەبوو بەهۆی بێئیشیو گرانیو بێزاری لەناو کۆمەلانی خەڵکدا.

سەرەڕای ئەم کردەوانەش کەدۆستایەتی شێوێننو زیلەکانیشی هەمیشە لەشەقامەکانی شارەکانماندا لەگەڕەکێك هەمیشە شەڕێکی سەخت بەرپابوویێتو لەهەموو کوچەو کۆلانێکدا ئاگرباران بێت، کەچی کاربەدەستانیش لەباتی چاککردنەوەی ئەم باری گرژییەی ئەمڕۆ هەر لەهەڕەشەو گورەشەدان سەبارەت بەوەی کەگوایە بۆردومانمان ئەکەنو شالاو دێننە سەر شارو دێهاتەکانمان وەئەڵێن ئاگر بەرئەدەینە هەموو ماڵێك، ئێوە ئەی کاربەدەستە شەڕەنگێزەکان وادیارە درستان لەڕابوردو وەرنەگرتووە یان رەنگە

## بەڵگەنامەی ژمارە (٢٢)

### بەیاننامەی ڕێکخراوە دیموکراتییە کوردستانییەکان بەبۆنەی یادی شەهیدانی (٩)ی حوزەیرانی ١٩٦٣-وە

دوای ئـەوەی چەتـە بەعسـییەکان کاروبـاری وڵاتیـان گرتەدەسـت کەوتنەپەیماندان و قسەی شیرین کردن دەربارەی شۆڕشی پیرۆزی گەلەکەمان وەدروستکردنی وەفدێك بۆ گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشدا بەسەر زاری. بەڵام لەژێرەوە کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ شەڕێکی دڕندانەو هێرشێکی کتوپڕ بۆ سەرگەلی کوردی ئاشتیخواز. تا لەبەرەبەیانی (٩)ی حوزەیراندا قەدەغەی هاتووچۆیان کردو دەستی پیسیان بـەجارێك خستەڕوو بـەگرتن و کوشتنی خـەڵکی بێتاوانی شارەکانی کوردستان کە لەچەکی بیروباوەڕ بەو لاوە هیچ چـەکێکی کـەیان پێنـەبوو بـەنیازی لـەناوبردنی نەتـەوەی کـورد وە بۆئـەو مەبەستە دەسەڵاتی کوشتن و بڕینیان دایە هـەموو جەندرمەیەکیان بەبەیانێکی رەسمی لە(مەجلسی قیادەی ثورة) جەردە بەعسیەکان دڕندەییەکی ئەوتۆیان نواند کەتائێسـتا نەبیسـتراوە بەتایبـەتی لەشـارەکانی سلێمانی و کـەرکوك و هـەولێرو کۆیـەدا بەسـەدان رۆڵـەی قارەمـانی کوردیـان نـا بەنیشـانەوەو زیندەبەچاڵیان کردن و هەزاران لاوو پیرو ئافرەت و منداڵی بێتاوانیان ترنجانە بەندینخانەو تەویلەی ئۆردوگاکانیانەوە. بەدەیان ئافرەت پەلاماردان و بەدەیان خـێزان دەربـەدەکراو ماڵیـان کـاولکرا. چـواردەوری شـارەکان بەسـەنگەری سەرباری تانك چنرا تاوای لێهات ڕێگای هاتووچۆی شارەکان بەهیچ جۆرێك نـەما و برسـێتی و بێدەرامـەتی تـەنگی بەخـەڵکی هـەڵچنی. ئەمـە لەلایـەك لەلایەکی تریشـەوە هێرشـێکی جانـەوەرانیان بردەسـەر گونـدو شـارە ئازادکراوەکانی کوردستان بەفڕۆکەو تۆپ و تانك کەوتنە وێرانکردنی دێهاتی کوردسـتان و کوشـتن و گرتنـی دانیشـتوانی بێتاوانیـان و دەرپـەڕاندنیان و نیشـتەجێکردنی عەشـایەری عـەرەب لەمەڵبـەندەکانیاندا. دەغڵ ودانـی ئـەو ساڵەی بەرهەمی جوتیارانی کوردستان بەئاگری ئەو فاشستانە دامرکایەوە.

بەڵام ئەو هێرشە دڕندانەیە بەهیچ جۆرێك لەبیروباوەڕی خەڵکی قارەمانی کوردستانی کەم نەکردەوە بەڵکو بەپێەوانەی ئامانجی دوژمنانەوە تا ئەهات باوەڕی خەڵکی کوردستان بەشۆڕش و سەرکەوتنی بەهێزتر ئەبوو رق و قینیان بەرامبەر دوژمنانی نەتەوەکەمان زیاتر ئەبوو خەڵکی زیاتر بەگەرم ترەوەو خۆی بەخت ئەکرد لەپێناوی ئامانجەکانی شۆڕشدا. بۆیە رۆڵە نەبەزەکانی گەلەکەمان بەرەو پیری مردن ئەچوون و رێگەی شەرەف و سەربەرزیان هەڵئەبژارد نەك سەرشۆڕکردن بۆ دوژمن. قارەمانێتی ئەو شەهیدانە بەجۆرێك بوو تەنانەت جێی سەرسوڕمانی ئەو جەردە خوێن ڕێژانەش بوو.

پێشمەرگە قارەمانەکانی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان بەو پەڕی لەخۆبووردن و ئازایەتییەوە بەرەنگاری تۆپ و تانکی دوژمن بوو وەلەهیچ فیداکارییەك درێغیان نەئەکرد لەپێناوی پاراستنی قەوارەی نەتەوایەتیماندا. وەهێرشەکانیان بۆ سەر دوژمن توندتر ئەکردو هەر رۆژە ناوچەیەکیان لەدەسەڵاتی دوژمن پاك ئەکردەوە.

پاش چەند مانگێك سوپای بەعسییەکان لەژێر جەزرەبەی تیپەکانی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان شپرزە و شەق و شڕبوو لە ۱۹٦۳/۱۱/۱۸دا تاقمێك لەکاربەدەستانی میری و ئەفسەرانی ئەو سوپایە توانییان هەڵگەڕانەوەیەك پێکبهێنن و بەعسییەکان لابدەن. وەبەسەرۆکایەتی عەبدالسلام عارف جێگەیان بگرنەوە.

کاتێك تاقمی عارف کاروباریان کەوتەوە دەست کەوتنەوە بەکارهێنانی پیلانی بەعسییەکان بەرامبەر بەشۆڕشە پیرۆزەکەمان بەدروستکردنی گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشدا بەنیازی کات بردنەسەر و پاککردنەوە ریزەکانی خۆیان و دەمکوتکردنی هەموو دەنگێك و تەفروتوناکردنی هەموو هێزێك کەبەربەرەکانیان بکات لەناو دەستەو کۆمەڵە عیراقییەکاندا. بەکورتی تاقمی عارف لەپێناوی چەند ئامانجێکی تایبەتی خۆیاندا هەندێ هەنگاو ئەنێن کەگوایا نیازی چاکەیان هەیە لەگەڵ گەلی کوردا وەئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە هەر ئەمان بوون هاوبەش و داردەستی بەعسییەکان لەلێدانی گەلی کورد.

ئەی رۆڵە بەشەرەفەکانی گەلی کورد خوێنی شەهیدەکانمان داوامان لێنەکەن کەزیاتر چاوکراوەبین و یەکێتیی ریزەکانمان بپارێزین و پتەوی بکەین. دەرفەت نەدەینە هەلپەرستان و دوژمنان بۆ سوودی تایبەتی خۆیان تێکی بدەن و بەپەیمانی درۆ تەفرەمان بدەن. پێویستە زیاتر پشتگیری شۆڕشەکەمان بکەین و بەردەوام بین لەخەباتی و کۆڵنەدانی نەتەوەکەیان وە دڵنیان لەوەی رەنج و خۆبەختکردنیان بێهودە نەبووە و خوێنیان بەفیڕۆناڕوات بەڵکو هاکا لەسایەی یەکێتی و قوربانی و خەبات و سەروەری پارتی دیموکراتی کوردستان و پێشمەرگە قارەمانەکانی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان و رێکخراوە کوردستانییەکانەوە شەبەقی بەخوێن ئاڵهەڵگەڕاوی ئۆتۆنۆمی لەئاسۆی کوردستانی عیراقدا دەرکەوێت. ئێمەی ئافرەتان و لاوان و مامۆستایان و قوتابیانی کوردستان بەم بۆنەیەوە پەیمان تازە ئەکەینەوە کەلەرێبازی کوردایەتی لانەدەین و دەستبەرداری شۆڕش نەبین وە ئەو رێگەیەی شەهیدانمان گرتیانەبەر بەریەدەین تا ئامانجەکانی شۆڕش بەتەواوی دێتەدی و ژیانێکی خۆش و ئاسوودە بۆ گەلەکەمان دروست ئەکەین.

نەمری بۆ گیانی پاکی شەهیدانی رێگای رزگاری کوردستان

پتەوتربێت ریزەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی

سەرکەوتن بۆ شۆڕشەکەمان بەسەرکردایەتی پارتی پێشڕەوی خەڵکی کوردستان بۆ بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عیراق و دیموکراتی بۆ عیراق.

*مەکتەبی سکرتاریەتەکانی*
*یەکێتیی قوتابیانی کوردستان-عیراق*
*یەکێتیی ئافرەتانی دیموکراتی کوردستان*
*یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان*
*یەکیەتی لاوانی دیموکراتی کوردستان*
**١٩٦٤/٦/٩**

*دەقە ئەسڵییەکەی بەیاننامەکان، لەهەردوو ئەو کتێبانەدا بڵاوکراونەتەوە، ئێمە بەپێویستمان نەزانی لێرەدا دووبارە بڵاویان بکەینەوە.

## ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣

# پێشینەو کارەسات
# هۆو سەرەنجام و پەندەکان

مەحمود مەلا عززەت

ئەگەر بابەتی و واقیعبینانە کارەساتی نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣و روداوەکانی ئەو چەند مانگەی دواتر کەتائەوکاتە خوێناوی و دڕندانەترین هێرش بوو لەدژی گەلی کوردستانی عیراق، بنرخێنرێن، وادەبێت پێشینەو رووداوەکانی بەر لەو مێژووە، شێوەی هێنانە سەر حوکم و سروشت و ئایدیۆلۆجی حزبی بەعسی عیراقی و دیاردەو هەلومەرجەکانی سەردەمەکە، لەبەرچاو بگیرێن، راست و گونجاو، بەپێی ئاستی تێگەیشتن لەرووداوەکان، ئەو هەنگاوانەو هۆو سەرەنجام و زیان و دەستکەوتەکانی هەڵبسەنگێنرێن..

بۆ ئەوانەش وێنەگیرییەکی سەردەمەکەو دیاردەو رووداوەکان کارێکی پێویستە، بۆ ئەمەش باش وایە چەند تیشکێك بخرێتە سەر ئەم لایەنانەی خوارەوە کەوێنەیەکی گشتیی بارودۆخەکانی رۆژگاری روخانی حوکمی عەبدولکریم قاسم لەلایەن حزبی بەعسەوە دەخەنە پێش چاو:

* دوا ساڵ و مانگەکانی حوکمی زەعیم عەبدولکەریم قاسم پڕبون لەگۆڕان و رووداوو هەڵچون و داچوون و گرژی و توندوتیژی کەعیراقیان پڕکردبوو لەناکۆکی و زۆرانبازی و پێکدادان...

*بانگەشەی تواندنەوەی کوردو تەرخان کردنی لاپەڕەکانی رۆژنامە حکومەتی و گروپە کۆنەپەرستەکان بۆ ئەو هێرشە ناڕەوایە..

*دیکتـاتۆرێتی تاککەسـیی گەیشـتبووە ترۆپکـی کـێرڤی سـەپاندنی دەسەڵاتی دژ بەیاساو مافی هاووڵاتیان..

*کوردستان کرابووە مەیدانی هێرشی سەربازیو ئاسمانی، بێ ئەوەی بیر لەچارەسەری کێشەو مافە رەواکانی کوردو شەریکایەتییەکەی کوردو عەرەب کەلەدەستوری کاتیدا تۆمار کرابوو، بکرێتەوە.

*پەلاماری هێزەکانی تری عیراقو راونانی تێکۆشەران: بەتایبەتی حزبی شیوعیو حزبە دیموکراتو بورجوازییەکانو زەوتکردنی ئازادییەکان.

*دەرگا بۆ کۆمەڵو تاقمە کۆنەپەرستو رەگەزپەرستان خرابووە سەرپشت تا راوی نیشتمانپەروەران بکەنو لەو کارانەدا بووبونە بەشێك لەدامو دەزگا جاسوسیو پۆلیسییەکانی رژێم..

*زیـاتر چـالاکبوونی هـەوڵی بـەرەی خۆرئـاوا بـۆ روخـاندنی حوکمـی عەبدولکەریم قاسم، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کەوتوویێژ لەسەر نەوت ئاڵۆز بوو بوو، گوشاری زیاتر دەخرایە سەر عیراق بۆ داشکان بۆیان...

*سەپاندنی باجی زەوی لەکوردستاندا.

*گوێ نەگرتن لەداواو داخوازیو پێشنیارەکانی جەماوەری گەلو حزبە دڵسۆزەکانیان بۆ بەئاشتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردو شۆڕشەکەی.

*چـەکدارکردنی عەشـیرەتەکانی سـەر بەحکومـەتو هاندانیـان لـەدژی عەشیرەتە نیشتمانپەرورەکان.

*سوتاندنی دێهاتو خەڵك بەکۆمەڵ کوشتن وەك لەچنارەو سیارە.. لەسەر رێگەی سلێمانی-دەربەندیخان- هەڵەبجە کرا.

*بـۆ چاوترسـاندنو تۆقـاندنی خـەڵك، بەسـتنەوەی لاشـەی پێشـمەرگەی شـەهیدو خـەڵکی دێـهاتی بەدەبابـەو راکێشـانیان بەسـەر شـەقامەکانی سلێمانیدا.

*ئەوانەو گەلێ هۆی تر حوکمی عەبدولکەریم قاسمیان خستبوە ناو کێشەو گێژاوو تەنگەژەی عاسییەوە... زەمینە خۆشکەریش بون بۆ دوژمنانی قاسم لەنەتەوە پەرستە توند رەوو رەگەزپەرستو هەندێ لەگروپە توندڕەوە ئیسلامییەکان بۆ خۆ کۆکردنەوە بۆ پەلاماردانی حوکمو کودەتا لەدژی. ئەوەبوو لە٨-ی شوباتی ١٩٦٣دا بەکودەتایەکی لەپڕو کورتخایەن بەلام درندانەو خوێناوی، حزبی بەعسی عیراقی هێنرایە سەر حوکمو رژێمی عەبدولکەریم قاسمیان رووخاندو قەلاچۆی ناحەزو دوژمنەکانیان کرد.

دەی با لەبەرتیشکی ئەوانە، سەرنجێ لەرەوتی رووداوەکانو لەکوردو بارودۆخی شۆڕشەکەیو هەلویستەکان بدەین، کەلەبارودۆخێکی نائاساییو دژواردا توانرا لەماوەی دووسالو نیوی شۆڕشداو لەبەردەم ئەو کودەتایەدا. جولانەوە چەکدارییەکە خۆی بگرێ، رێکخستنەکان باش بوو بون، سەرکەوتنی گەورە گەورە بەدەست بهێنرێن، ناوچە دێهاتییەکانو گەلێ لەشارۆچکەکان رزگار بکرێن.. تا ئەو ئاستەی دەسەلاتی حکومەت هەر لەشارە گەورەکانو هەندێ شارۆچکە بمێنێت، ئەوەش زیاتر لەرۆژدا.. بۆیە دەتوانرێ بگوترێ شۆرش لەناوچەکانی سلێمانیو گەلێ شوێنی هەولێرو بادیناندا گەیشتبوە ئاستێکی بالا لەسەرکەوتنو بۆپێشەوە چوون.. لەبەر ئەوانە دەبوو هەنگاوو هەلویستەکان لەبەر رووناکیی ئەو دیاردەو بوونو رووداوانەدا بونایە..

رەنگە بۆ ئێستا، ئاسان نەبێت ئەوکارو هەنگاوانە بەپێی ئەو هەلومەرجانە هەلبسەنگێنرێنو کەموکورتیو هەلەو بۆشاییەکان دەستنیشان بکرێن.. بەتایبەتی ئەگەر بەهۆشیاریی، جیاوازیی نێوان هەردوو زەمینو زەمانەکەو هەلومەرجەکان، لەبەرچاو نەگیرێن... تا رووداوەکان وەك خۆیان بکەونە بەر لێکۆلینەوە، نەك بەپێوانەکانی سەردەم قسەیان لەسەر بکرێ.. لەهەموو حالەتەکانیشدا ئەبێت ئەو کارانە لەخزمەت مێژووی نەتەوەدا بێت، بۆ

هەڵهێنجانی دەرس و پەندەکانیش بن تالەئێستا و بۆ ئاییندەش سوودیان لێ وەربگیرێ.

دیارە وتووێژی شۆڕش- رژێمی نوێ، گەلێ سودو دەستکەوتیان هەبوو..

سەرەکییەکان:

*بۆ یەکەم جار بوو لەمێژووی سیاسیی نزیک بەچل ساڵەی دامەزراندنی دەوڵەت و وڵاتی عێراق بەتایبەتی دوای روخانی مەلیکایەتییەکەی شێخ محمود، ددان بەهەندێ مافی رووناکبیریی و ئیداریی کورددا بنرێ..

راستەوخۆ لەگەڵ کورددا وەك لایەنێکی خاوەن هەق و خاوەن ئامانج، وتووێژ بکرێ..

*ئەو لامەرکەزییەی هێنرایە ئاراوە بوو بەزەمینەیەك بۆ گەشەکردنی دروشم و ئامانج و داخوازییەکانی شۆڕش.

* ماوەی وتووێژ بوو بەسەردەمێکی حەوانەوەو پشوودان بۆ پێشمەرگەو تێکۆشەران... کەلەگەڵیشیدا پێداویستییەکان، کەلەکاتی شەردا بەدەست نەئەکەوتن، ئاسان پەیدا بکرێن و بگەیەنرێنە ناوچە رزگارکراوەکان.

* ئەو پرۆسەیە بوو بەئەزمونێکی خەباتی نەتەوەی کورد کەدەرس و پەندێکی زۆری لێوەردەگیرێ.

*دەنگی کوردو شۆڕشەکەی گەیەنرایە ناوچەکەو جیهان و تارادەیەك داوا رەواکانی گەیشتنە میدیای جیهان...

*ئەو دەنگدانەوەیەش یارمەتیدەرێکی باش بوو بۆ گەورەبوونی کێشەی سیاسیی و نیشتمانی و نەتەوەیی کورد.. تا ئەو ئاستە کەمەنگۆلیای میللی هەوڵی باسکردنی کێشەی کوردی بدا لە UN هەرچەندە لەدواییدا پاشگەزبووەوە.

لەگەڵ ئەوانەدا ئەو پرۆسەی وتووێژە بێ هەڵەو زیان نەبوو، کەبەداخەوە سوودیان لێوەرنەگیراوە:

-یەکێك لەدیاردە زەقەکانی سەعات و ڕۆژانی سەرەتای کودەتاکەی هەشتی شوبات، تاڕادەیەك بەهەڵە مامەڵەکردنی ئەو هەلومەرجانەبوو، بۆ نەخشەو لێکۆڵنەوەو هەڵوێستەیەکی گونجاو، ناردنی بروسکەی پیرۆزبایی بوو بۆ شۆڕشەکە (کودەتاکە) کەبەهاوشانی شۆڕشەکەی کوردستان لەقەڵەم درا، لام وایە بوونی نوسەرانی بروسکەکە لەبەردەستی بەعسدا، هەڵوێستەیەکی نرخاندنی کارەکە پێویست دەکات.

-پێدەچێ ئەوە یەکەم هەنگاوی سەرەتای هەڵە بووبێ کەهەڵەی تریشی بەدووی خۆیدا خوڵقاند..

-ئەوە لەکاتێکیشدابوو کەرژێمی تازە قەلاچۆی ئەندامانی حزبی شیوعی و حزبە نیشتمانییەکانی تری دەکرد، لەگەڵیشیدا هیچ جۆرە بەڵێنێکی بەکورد نەدابوو، زۆر باش بەعس دەناسرا...

ئەڵێن هەندێ دەنگی ناو سەرکردایەتیی پارتی و شۆڕش رایان وابوو کەشەڕ نەوەستێنرێ، شان بەشانی وتووێژ بەردەوام بێت، بەڵام بێدەنگ بوو یان بێدەنگ کرا..

-ئیتر لەو سەرەتایەو کۆنگرەی کۆیەشەوە، وتووێژ لەبەغدا دەستپێکرد... بۆ ئەوەی سەرحسابی سروشتی بەعس و ئەو هەلومەرجانەو گۆڕانی موعادەلە سیاسییەکان و پێچەوانە بوونەوەی هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت بکرێ، سود لەتازەیی حوکم و شڵەژاوی بارودۆخەکەی و ناکۆکی و هەرەشەکانی بەردەم و چواردەوری وەربگیرێ، پێشبینی تەقینەوەی ناکۆکییەکانی نێوان گروپە قەومی و ئیسلامییە توندرەوەکان بکرێ..

بۆیە دەکرا لەگەڵ وتووێژدا شەڕ بەردەوام بوایەو هەوڵی زیاتر لاوازکردنی رژێم و باشتر لێدانی بدرێ... لەبەر ئەوانە زەمینەیەکی باش بۆ حوکمی بەعس رەخسا کەچەپۆکی کوشندە ئاراستەی حزبی شیوعی بکات ، خۆشی بۆ شەڕی شۆڕشی کورد ئامادە بکات.. مانۆڤری سیاسی و دەستی دەستی

بەكورد بكات. لەگەڵ سوریادا هاوكاریی سەربازی بهێنێتە ئاراوەو هێزی ئەویش بگەیەنرێتە بەرەكانی شەڕی دژ بەكورد. سەرەنجام باش نەناسینی دوژمن‌و گونجاو مامەڵە نەكردنی، بەپێی سروشت‌و ناسینەكەی، سەركەوتن مەحاڵ دەكەن.

لەو رۆژگارەدا جێگری لێپرسراوی لق‌و ئەندامی لقی سلێمانی پ.د.ك بووم. هەرچەندە بۆ لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە گوێزرابوومەوە بەڵام لەو رۆژانەدا لەسلێمانی بووم، لەگەڵ لیژنەی ناوچەی سلێمانیدا كۆبوونەوەیەك كرا تاباسی وەزعی تازەو هەنگاوەكان بكرێ، لێپرسراوی لق باسی چالاكی‌و خۆپیشاندان‌و چوونە سەرشەقامەكانی كرد... لەناو مشتومڕەكاندا گوتم ناكرێ وازوو پێش ئەوەی لەهەڵوێستی رژێمی تازە بگەین‌و هیچ هەڵوێستێكی نەبێ‌و نەزانین چی ئەكەن، ئێمە رێكخستنەكانی خۆمان بخەینە سەر شەقامەكان‌و بەرچاوی دەزگا سیخوڕییەكان‌و لایەنگیری حوكمەكە بكەین..

كەلێنێكی تری ناو هەڵوێستەكان، هەرچەندە مەكتەبی سیاسی پرۆژەیەكی زۆر باشی حوكمی زاتی كرد بەبنچینەی وتووێژ، بەڵام رژێم ئامادە نەبوو گیان بەبەر لامەركەزییەكەی خۆشیدا بكات، بۆیە هەڤاڵ مام جەلال سەرۆكی وەفدی كورد لەسەفەرەكەیدا بۆ قاهیرەو بینینی جەمال عەبدولناسری رەحمەتی، سەرەڕای هەلوێستە باشەكەی.. وەفدەكەی بەغدای بەجێ هێشت‌و لەڕێگەی بەغداوە نەگەڕایەوە عیراق..

یەكێك لەو دیاردە هەستیارانەی لەم پرسیارەدا خۆی دەنوێنێ: ئەی بۆچی وتووێژ دوای ئەو هەڵوێستەی سەرۆكی وەفدی كورد بەردەوام بوو، بێ ئەوەی ئایندەی نەگەرەكان لەپێش چاو بگیرێ‌و بەباشی خۆ ئامادە بكرێ. بەتایبەتیش دوای ئەوەی جموجۆڵی عەسكەری‌و خۆئامادەكردن لەبەرچاو بوو؟ ئەوە باسێكی گرنگەو دەكرێ لێكۆڵینەوەی تێرو تەسەلی لەسەر بكرێ.

پێش نوێی حوزەیران بەچەند ڕۆژێك. هاتبومەوە سلێمانی... بەیانییەك ئاگادارکرام کەسەیتەرەو رەبیە لەسەیوان دادەنێن، لەپەنجەرەی ژوورەکەمەوە، کەراستەوخۆ سەیوانی لێ دیار بوو سەیرم کرد...راستەو بەتەلی دڕکاویش چواردەورەکەی دەگرن...یەکسەر هەستام و بۆ هەڵەبجە گەڕامەوە تا لەگەڵ لێپرسراوانی پێشمەرگەدا ئامادەکاری بۆ ئایندەو ئەگەرەکان بکەین...

مەبەستم ئەوەیە، دەبوو ئەو دیاردانە بەجیدی وەربگیرانایە... ئیتر لەناو ئەو بارودۆخ و ئاڵۆزیانەداو لەبەرەبەیانی ٩-ی حوزەیراندا، زەنگی کارەسات لێدراو بانگەشەی قەدەغەکردنی هاتن و چوون لەشەقام و کۆڵانەکانی سلێمانیدا بەرزبووەوە...لەکاتێکدا هێرشی زەمینی بەتانك و تۆپەوە لەگەڵ هێزی ئاسمانیدا، بۆ سەر ناوچە رزگارکراوەکان دەکرا...لەناو شاریشدا هێزەکانی عەسکەرو ئەمن کەوتنە پشکنینی یەکەیەکەی گەڕەك و شەقام و کۆڵانەکان، ماڵ بەماڵ دەگەڕان و کەوتنە گرتنی قوتابی و گەنج و لاوو میانتەمەن و هەڵکشاوتریش، تا لەسلێمانیدا زیاتر لە (٥) هەزار کەس گیران، لەبارودۆخێکی خراپ و پڕ لەپیس و پۆخڵی و شوێنی گەرم و پڕ لەپەتا و بێ نان و ئاو-لەسەرەتادا...لەزیندان توندکران...ئینجا کەوتنە گەڕان بەدوای لێپرسراوو تێکۆشەرانی ڕێکخستن، بۆ دۆزینەوەی سەرەداوێك، تەنانەت پەنایان بۆ (شێت) دەبرد بۆ دەستنیشان کردنی تێکۆشەران...لەگەڵیدا سەدانیان راپێچی مەحکەمەی وادی کرد، لەدادگاییکردنێکی تەواو نایاسایی و نامۆدا زیاتر لەسەد کەس بێ تاوان و بێ چەك راستەوخۆ حوکم دران و گوللەباران کران و هەر لەوێشداو لەچاڵی بەکۆمەڵدا خۆڵیان بەسەردا کرا، زیاتر لەوانە هەموو ئەو کەسانەی دەکەوتنە دەست عەسکەر لەسەیتەرەکانی چواردەوری شار رەمی دەکران و گڵیان بەسەردا ئەکرا...کەکۆی شەهیدانی نۆی حوزەیران بە ١٧٢ کەس مەزەنە دەکرێ، چونکە ژمارەی تەواو بەدەستەوە نیەو تا ئێستاش تەرمی گەلێ لەوانە نەدۆزراونەتەوە، جگە لەوانە ژمارەیەکی

زۆر لەخەڵکی شار لەترسی گرتن و کوشتن روویان کردە ناوچە رزگارکراوەکان.

کورت و پوخت-مۆو هۆکارەکانی دیاردەو رووداوەکە، دەرس و پەندەکانی، هەڵەو بۆشاییەکان، هەنگاوە بەسودەکانی، بەشێکن لەئەزموونی دەوڵەمەندی کارەسات و مەینەتیەکانی گەلەکەمان...هۆشیارمان دەکەنەوە: بۆناسینی دۆست و دوژمن و دروست مامەڵەکردنی، لەخۆو لەدەوروپشت گەیشتن، لەسیاسەتی دەوڵەتە هەرێمی و گەورەکان گەیشتن و هەوڵی سود وەرگرتن لەناکۆکییەکان، ئەوانە کاری هەستیارو گرنگی سیاسەتمەدارانە..

هەڵبژاردنی زەمین و زەمان و مەودای وتووێژو بەردەوامیی بەپێی دەستکەوتەکان و مەزەنەی زیانەکان...باش تێگەیشتن لەبارودۆخ و هەلومەرجەکان، لەپێشبینی ئەگەرەکانی بەردەم و گۆڕانەکان، ئەوانە بەشێکی تر ئەرکەکانی سەرکردایەتییە.

نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣ و رووداوەکانی تر ئەوەیان سەلماندووە کەحوکمی دیموکراسی و فرە حزبی و فرە نەتەوەو کەمینە نەتەوەیی و مەزەبییەکان، تاکە رێگەی سەرفرازیی تەواوو رەخساندنی ئازادیە بۆ هەمووان...بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، بزوتنەوەیەکی دیموکراسی و ئازادیخوازە، پشتو پەنای گەلانی عیراق و تێکۆشەرەکانە، پەناگەی ئاوارەو لێقەوماوانی نەتەوەی کوردە، لەکاتی تەنگانەدا جێگەی حەوانەوەو شانۆی سیاسی خەباتیانە...هەر لەبەر ئەو راستیانەیە کەدەبێت ئەوانیش یارمەتیدەرێکی کاریگەری خەباتی خەڵکی کوردستان و داخوازییە رەواکانی بن. بۆ رزگاری و ئایندەیەکی دیموکراسی پڕ لەئاشتی و خۆشی، پشت و هاوکاری بن و رەچاوی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی بکەن، یارمەتیدەری چارەسەری ناکۆکییەکان بن نەك ئاڵۆزو زیاترکردنی...

# بۆنەوەی شەهیدانی نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣
# لەمە زیاتر وننەبن

**محەمەد نوری تۆفیق** *

٣٩سالّ لەمەوبەر لەرۆژێکی وەك ئەمرۆی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣دا، لەرۆژگارێکی رەش و سەختی ئەم کوردستانەدا لەکاتێکدا کەهێشتا گفتوگۆکانی نێوان سەرکردایەتی کورد بەسەرۆکایەتی هەڤاڵ مام جەلال و کودەتاچییەکانی ئەو سەردەمەی بەغدا، کەدەستەی یەکەمی بەعسیەکان دژ بەحوکمی عەبدولکەریم قاسم لەرۆژی ٨ی شوباتی ئەو ساڵەدا ئەنجامیاندا بوو، ئالەو کاتەدا کەبزووتنەوەی کورد بەرابەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بەپەرۆشبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەرێگەی دیالۆگ و وتووێژەوە، لەو سەردەمانەدا کەسەرۆکی وەفدی کورد لەقاهیرە چاوی بەسەرۆکی کۆچکردووی عەرەب (جەمال عەبدولناسر) کەوتبوو بەیاوەری وەفدێکی نەتەوەیی عەرەب لەعیراق و پیاوانی دەستە باڵاکەی کودەتاچییەکان کەگوایە بۆ راوەرگرتنی ئەو زاتە بزانن (جەمال عەبدولناسر) کەرای ئەو ئەوەبوو کەدەبێ کودەتاچییەکانی بەغدا دان بەمافی گەلی کورددا بنێن و نابێ جارێکی‌تر سوپای عیراق شەری کوردبکات و دەبێ هەموو هێزەکانی عەرەب شەری ئیسرائیل بکەن! بەڵێ لەو رۆژگارەدا پیلانچییەکانی بەغدا هەر لەژێر سایەی ئەو گفتوگۆیانەدا کەلەشوباتی ئەو ساڵەدا لەنێوان کوردو بەغدادا دەستیپێکردبوو، خۆیان پرچەك دەکردو دەیان پیلانیان دادەرشت بۆ کۆتاییهێنان بەشۆرشی رزگاری کوردو قەلاچۆکردنی گەلی کوردو جینۆسایدی

نەتەوەییان لەکوردستاندا. لەو رۆژە سەختانەدا کەشۆڕشی کورد پێی دەنایە سێیەم ساڵەوە کەجەماوەری گەلەکەمان تەنیا پشتیوان و پاڵپشتیبوون و کەسێك نەبوو نەلەوڵاتە عەرەبییەکان و نەلەدەوڵەتە ئیسلامییەکاندا (جگە لەحزبی شیوعی عیراقی، کەئەوانیش لەکودەتا رەشەکەی ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا گورزێکی یەجگار کوشندەو جگەربڕیان بەرکەوتبوو، هێزێکی ئەوتۆ نەبوون کەبتوانن تەرازووی هێز بەلای خۆیاندا رابکێشن)، بەڵێ نەدەوڵەتێکی عەرەبی، رێگەی لەو هێرشە گرت و هەموو نەتەوەی عەرەب دەنگێکی نارەزایی لێبەرزنەبووە، نەگەلانی موسڵمان و حزبە ئیسلامییەکانی بەوانی گوت: کارێکی وا بەرامبەر میللەتی کوردی موسڵمان مەکەن نە خوا قەڵاچۆکردنیانی حەڵاڵ کردووەو نەپێغەمبەری ئیسلام (د.خ) پێیخۆشە. ئا لەو رۆژگارە تاریك و نوتەکەدا کەجگە لەجەماوەری کوردو شاخەکانی کوردستان کەس لەگەڵ شۆڕشی کورددا نەبوو، لەبەرەبەیانی ٩ی حوزەیراندا لەکاتێکدا خەڵکی کوردستان لەزاخۆوە تا خانەقین گوێیان بۆ رادیۆی بەغدا رادێرابوو کەشتێك لەبارەی گفتوگۆی کوردو دەسەڵاتدارانی بەغدا ببیستن، ئا لەو کاتەدا زۆر بەشێوەیەکی نامەردانەو نەهێنگیری ئەو دەسەڵاتدارە فاشیانە هەرچی هێزی سوپا و جاش و حەرەسی قەومی تاوانبار لەبەردەستیاندا بوو، بەهاوکاری سەدان فڕۆکەو تانك و تۆپیی قورس و سووك هەیە بەرەو کوردستان رەوانەیان کردبوو، بەسەرکردایەتی توندترین ئەفسەری عەسکەرییان وەك زەعیم سدیق مستەفا و تەها جواد شەکرچی و غانم أمین المصباح و عەقید سالم و چەندین کەسیتری وەك ئەوان، کەسانێکی فاشی و داخ لەدڵی لەو کەسانەو هەموو دەسەڵاتێکی کوشت و بڕیان پێدرابوو لەسەرتاسەری کوردستاندا بەگشتی لەکەرکوك و کۆیەو هەولێرو شارو شارۆچکەو گوندەکاندا و بەتایبەتی لەشاری سلێمانی و دەوروبەریدا کە(بەسەری مارەکە-راس الحیە) پێناسەیان دەکرد. لەبەرەبەیانی ئەو رۆژەدا

ئەم شارە تێکۆشەرو کۆڵنەدەریان کرد بەشەوەزەنگی کوشتن و بڕین و گرتن و ڕەشبگیرێکی ئەوتۆ کەلەمێژووی نوێی جیهاندا بێوێنە بوو. لەو ڕۆژەدا کەبەڕۆژی ڕەشی ٩ی حوزەیران ناونراوە، پاش قەدەغەکردنی هاتووچۆ بەهەزاران لەسەربازی سوپای داگیرکەر بەناکاو و کتوپڕدا ڕژانە ناوشار بەکووچەو کۆڵان و گەڕەکەکاندا بڵاوبوونەوە، بازاڕو دامودەزگاو قوتابخانەکانیان کۆنترۆڵی عەسکەری کرد، ماڵ بەماڵی ئەم شارەیان کەوتەبەردەست، بەهەزاران لاووپیرومنداڵیان ڕاپێچی تەویلەکانی حامیەی سلێمانی کرد، بەدەیان کەسیان بەبێ گونا شەهید کرد کەژمارەیان زۆر لەوە زیاترە تائێستا بڵاوکراوەتەوە، چونکە لەناویاندا دەیان لادێنشین، کەبەرەو شار هاتبوو بۆ کارو کەسابەت و بێئاگابوون لەو بەرەبەیانە شوومەی کەسەدان چاڵی مەرگی لەناکاویان بۆ هەڵکەندرابوو، دەیان کەس هاتبوونە ناوشار بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و ئیشوکاری تایبەتی، لەهەموو ئەوانە مەگەر تاکو تەرا گەڕابنەوە ناو کەس و کاریان، ئەگینا تائێستا لای کەسوکاریان بەشەهیدی وبناو دەژمێررێن، لەکاتی هەڵدانەوەی تەرمە زۆروزەوەندەکانی ناو حامیەو (شیوی مەرگ-وادی الموت)دا چەندین لاشەی نەناسراو دەرکرا (کەلە ساڵی ١٩٦٤دا لەکاتی ئاگربڕی بەغداو شۆڕشی کورددا ئەو ڕێگەیەدرا کەخەڵکی بەدوای تەرمی شەهیدانیان بگەڕێن) ئەو کەسانەی ئاگاداری ئەو بەشوێن گەڕانەن هەموو ئەو دەڵێنەوە کەچەندین تەرمی کەسانی نەناسراویان دەرکردووە کەجل و بەرگی کوردەواری لادێیان لەبەربووە. شەرواڵ و مرادخانی‌یان لەبەردابوو، جامانە، یان مشکی و جامانەیان لەملدا بووە،چەندین کەسی نەناسراویان لەو شیوی مەرگەی کەئێستا (پارکی ئازادی) لەسەر بیناکراوە، دۆزرانەوەو خاوەنیان نەهاتوون بەلایانداو جەماوەری شار ئەوانیشیان لەگردی شەهیدان ناشت، وەك شەهیدە دیارو ناسراوەکانیان. ئەمە جگە لەوانەی کە لەدەوروبەری شار دەیان کەس لەڕەبیە

لەژمارە نەهاتووەکانەوە گوللەبارانکران‌و بوون بەخۆراکی قەل‌و دال‌و حەیوانی درندە لەڕێگەی کەرکوک-سلێمانی، سلێمانی-قەرەداخ، سلێمانی-شارباژێڕ، سلێمانی-هەڵەبجە، سلێمانی-دەربەندیخان، سلێمانی-ئەزمڕو گوێژەو هەموو ڕێگەو بانەکانی‌تردا چەندین شەهیدی نادیارو نەناسراو دەستڕێژکران.

لەناو شاریشدا چەند دەستەیەك لەشەهیدان گوللەبارانکران کە لەچاکترین‌و بەئەمەکترین‌و دڵسۆزترین خەڵکی شاری هەڵمەت‌و قوربانی بوون (کەلەلیستی شەهیداندا ناویان هاتووە).

لەم لاشەوە زیاتر لە دوو هەزارو پێنج سەد کەس لەخەڵکی شار لەو ڕەشبگیرییەدا لە(ئەستەبڵەکانی-تەویلەکانی سوارەی حامیە)دا بۆ ماوەی چەند مانگێك بەوپەڕی توندوتیژی‌و هەر بەچەشنی ئەو دیلانەی کەکەوتبوونە بەردەستی سوپای عیراقی کەبەچەشنی ئەڵمانیای نازی لەجەنگی دووەمی جیهانی‌و بگرە خراپتریش هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا ئەکردن‌و هەندێ لەو پیاوانە ماوەی چەند مانگێك لەو بەناو زیندانەدا مانەوەو تووشی لێدان‌و ئازارو ئەشکەنجەبوون‌و کەسانێکی زۆریان لەو شوێنەدا تووشی نەخۆشی بوون‌و هەر بەو نەخۆشیانەش لەدوای ئازادکردنیان گیانیان لەدەستداوە (هەر لەم نامیلکەیەدا ناوی ژمارەیەك لەو کەسانە کەبەر دەستکەوتووەو بڵاوکراوەتەوە).

مەخابن‌و زۆر بەداخەوە کەلەماوەی نزیکەی ٤٠ساڵی دوورودرێژ، بەتایبەتی پاش ١١ساڵ لەم ئازادییەی ئەمڕۆی کوردستاندا، کەحکومەت‌و دامودەزگای خۆماڵیمان هەیە، لەچوارساڵی بەیاننامەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠دا کەحوکمی کوردستان بەدەست خۆمانەوە بوو، کەچی نەتوانرا سەرژمێرێکی شەهیدانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بکرێ‌و ناویان لەمێژووی کوردستاندا تۆماربکرێت. بۆیە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە وەزارەتی مافی مرۆڤ‌و ئاوارەو ئەنفال، هەروەك چۆن سەرژمێرێکی ئەنفالەکانی کرد، بەوجۆرەش

سەرژمێرێکی شەهیدان و ئازارکێشانی ئەو رۆژگارە بکات کەسەرەتای جینۆسایدو ئەنفالی ئەم کوردستانەیە. هەروەها دەزگای شەهیدانی کوردستان لێپرسراوە بەرامبەر بەو شەهیدانەو مسۆگەرکردنی ژیانی وەرەسەکانیان، هەروەك چۆن هەموو حزب و دەزگاو کۆمەڵەو سەنتەرەکانی تایبەت بەجینۆسایدو ئەنفال لێپرسراون بەرامبەر بەو ئەرکە گرنگەی رووداوەکانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣.

لێرەدا ئەبێ ئاماژە بەدەوری ئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی بدەین کەبۆ یەکەمجارو لەسەر رێنماییەکانی بەڕێز سەرۆکی هەرێم کەحامیەی سلێمانی، ئەو رەمزی ژێرچەپۆکی و سەرشۆڕییەی گۆڕی بە(پارکی ئازادی) کەئەمڕۆ رەمزی ئازادیی و سەرفرازیو جێگەیەکی گەشتوگوزاری و پاریکردنە، کەئەم کارەش جوانترین کارە بۆ رێزنان لەگیانی هەموو شەهیدان و زیندانیکراوەکانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣. هەر ئەم ئەنجومەنی شارەوانییە لەیادی ٣٩ساڵەی ئەو کارەساتەدا بەنیازە کەهەر لەپارکی ئازادیدا پەیکەری شەهیدانی ٩ی حوزەیران دروست بکات و ئەم نامیلکەیەی وەك نۆبەرەیەك بۆ مێژووی کوردو هێمایەك بۆ سەروەریی شەهیدانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا بەچاپگەیاند وەك بڵاوکراوەیەکی گۆڤاری سلێمانی.

*سەرنووسەری گۆڤاری سلێمانی

# هەڤاڵ محەمەد چاوشین

## لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣ هەڵدەداتەوە

هەڤاڵ محەمەد چاوشین کەتێکۆشەرێکی دێرینەو هەتا ئێستا لەسەر ڕێبازی کوردایەتی بەردەوامەو پیاوێکی ناسراوو ناودارە لەناو ریزەکانی ئەو رۆژگارەی (پ.د.ك)و ئێستای (ی.ن.ك)دا. یەکێکە لەو کەسانەی کەلەنزیکەوە ئاگاداری کارەساتەکانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣یەو یەکێك بوو لەو هەزاران کەسەی کە لەحامیەی سلێمانیدا لەو رەشبگیرەدا دەستگیرکرابوو، ئاگاداری زۆر لەوردەکارییەکانی رۆژگاری پێش ٩ی حوزەیران و دوای ئەو رۆژەشە، بۆیە بەپێویستمان زانی بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم نامیلکەیە لەچاوپێکەوتنێکدا بۆ رابردووەکانی خۆی بێتە قسەو ئەویش لەپاش ٣٩ساڵ، لاپەڕەکانی بیرەوەری ئەو رۆژەمان بۆ هەڵبداتەوە، کەدیارە ئەو بیرەوەرییانە زیادبوونێکە بۆ مێژووی گەلەکەمان بەگشتی و رووداوەکانی ئەو رۆژە رەشانە بەتایبەتی، کاکە حەمە چاوشین بەسوپاسەوە داواکەمانی بەجێهێناو ئێمەش زۆر سوپاسی دەکەین. هەڤاڵ محەمەد چاوشین لاپەڕەکانی ئەو رۆژگارە سەختەی ئاوها بۆ باسکردین:

(پ.د.ك) سەرکردایەتی رێکخستنەکانی پارتی دەکرد لەلیوای سلێمانیدا، کەئەندامەکانی ئەو بەڕێزان بوون، عەلی حەمدی-لێپرسراوی سلێمانی، مەحمود حاجی تۆفیق، ئیبراهیم میرانی، مەحمود مەلاعزەت، شێخ سەعید، خالید کۆکۆیی، بەکر جاهد، سمکۆ فەتحوڵلا، تۆفیق مەلا سدیق)، ئەمانەو چەندین هەڤاڵیتر کەئامادەی کۆبوونەوە گشتییەکانمان دەبوون، ئەو

کۆبوونەوانەش بەردەوام و لەگەڵ پێویستی ئەو بارودۆخەدا ئەنجام دەدران، هەروەها بۆ هەر ناوچەیەك لیژنەیەکی ناوچە هەبوو، وەك لیژنەی ناوچەی سلێمانی، لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە، لیژنەی ناوچەی پێنجوێن، لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ و رانیە..هتد. هەریەك لەم لیژنانە ئەنجومەنی خۆی هەبوو کەلە ٩تا ١٢ ئەندام پێکهاتبوون و بۆ هەموو پیشەیەکیش رێکخراوێك هەبوو، لەرێی ئەم دابەشبوونانەوە بەهەزاران ئەندام لەو سەردەمانەدا لەریزەکانی پارتیدا درێژەیان بەخەبات و تێکۆشان دەدا.

باپێشەکی بەوە دەستپێبکەم کەئێمە لەدوای کارەساتی ٩ی حوزەیران و هێمنبوونەوەی بارودۆخی شار، هەروا دەستەووەستان نەبووین و بەرامبەر بەتاوانبار (زەعیم سدیق مستەفا) بێدەنگ نەبووین لەو هەموو خوێنەی کەبەناڕەوا لەم شارەدا رشتی و لەو هەموو زوڵم و زۆرەی کە لەسلێمانی و دەرەوەدا بەرامبەر بەجەماوەری گەلەکەمان کردی، بەڵکو پاش خۆرێکخستنەوەی ریزەکانمان چەند جارێك پلانی بەرەنگاریی شۆرشگێرانەمان بۆ دارشت تا بەسزای گەل و نیشتمانی بگەیەنین. یەکێك لەو پلانانە ئەوەبوو کەلەجادەی کانێسکان لەبەر مزگەوتی گەورە، سێ پێشمەرگەی قارەمانمان بۆ ئامادەکرد، کاتێ بەخۆی و حیمایەکانی لەو جادەیەوە بەرەو حامیەی سلێمانی دەبۆوە، ئەو سێ پیاوە قارەمانە، کەئێستا لەسایەی خواوە یەکێکیان ماوە، لێی هاتنەدەست و تەقەیان لێکرد، کەبەداخەوە چەکەکانیان لەو چەکانە نەبوون و لەکاتی تەقەدا راوەستابوو، بەوەش ئەو تاوانبارە لەو کەمینەدا بەرنەکەوت، هەروەها لەناوماڵەکەی خۆیدا بەدوایەوە بووین و لەپلانێکدا چەند کەسێکی ئازا ویستیان بەسزای گەل و شۆرشی بگەیەنن، کەچی لەوەشدا بۆی دەرچوو چونکە خۆی لەناو ماڵەکەیدا نەبوو، بەڵام لەئەنجامی ئەو ترس و لەرزەی کەلێی نیشتبوو، تووشی شەلەل هات و قسە هەیە کەگوایە لەقاهیرە مردبێ، ئێمە لەو رۆژگارەدا دەستمان

لەخوێنی شەهیدان هەڵنەگرت و بەدوای تاوانبارانەوە بووین و ئەوەندەی پێمان کرابێ، کردوومانە.

جابا بێینەوە سەر کارەساتەکانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣، ئێمە کەئەندامانی لقی سلێمانی و لیژنەی ناوچەی سلێمانی (پ.د.ك) بووین، لەو سەردەمەدا، ئاگاداری گەورەو بچووکی ڕووداوەکانی شارە تێکۆشەرەکەمان بووین، بەگوێرەی ٩ی حوزەیرانیشەوە پاش ئەوەی جڵەوی حوکمی عیراق کەوتەدەست بەعسییەکان لەئەنجامی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا، کەعەبدولسەلام عارف سەرکۆمار بوو، لەچەند ڕێگایەکەوە هەوڵی نزیکبوونەوەی حکومەتەکەی و شۆڕشی کوردی دەدا، دەیویست پارتی و شۆڕشی کورد گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەن، لەڕاستیشدا وەکو ڕۆژگار نیشانی دا لەوەدا تەنیا مەبەستیان چەسپاندنی ڕژێمەکەی خۆیان بوون، لەڕێی کابرایەکی عەسکەری و شۆڤێنی و کەللەڕەقی وەك زەعیم سدیقەوە کەفەرماندەی لیوای بیست بوو لەسوپای عیراقدا، بەندە کەئەندامی لق بووم لەلایەن (کاك جەمال حەمە سەعید پێنجوێنی)یەوە ئاگادارکرامەوە کەعەبدولسەلام عارف دەیەوێت لەڕێگەی یەکێك لەو کەسانەی کەکاك جەمال پەیوەندی پێوەدەکردن، پەیوەندیمان پێوەبکات، واتە بەسەرکردایەتی پارتییەوە، بۆئەوەی چیکە خوێن نەڕژێت و ڕۆڵەی گەلەکەمان شەهید نەبن، چونکە زەعیم سدیق چەندین ڕۆڵەی گەلەکەمانی شەهید کردووە، ژمارەیەکی یەکجار زۆری لەزینداندا توندکردووە، هەر لەو ماوەیەدا پانزە هاووڵاتی بەناهەق لەڕێی دەربەندیخان شەهید کردووە، جگە لەمانەش چەندین کاری دڕندانەی‌تر لەناو شاری سلێمانی و دەوروبەریدا ئەنجامداوە، ئێمەش وەکو ئەندامانی سەرکردایەتی حزبی و وەکو پێشمەرگە لەلقی سلێمانیدا، هەوڵێکی زۆرمان دەدا بۆ لەناوبردنی ئەم تاوانبارە بۆیە بەمەبەستی شەڕکردن بەرەو

خەباتێکی توندوتیژ دەڕۆیشتین، چونکە حکومەت بەنیازی شەڕبوو ئێمەش لەخۆئامادەکردندا بووین بۆ ئەو شەڕە.

بەڕێی ڕێکخستنەکانمان لەناو شاری بەغدا، کەبەنهێنی کاری باشیان دەکرد، هەروەها لەڕێی چەند برایەکی عەرەبی دڵسۆزەوە هەموو جموجۆڵەکانی حکومەت بەئێمە دەگەیشت، دواتریش زەعیم سدیق لەزاری خۆیەوە پێی‌وتین کەحکومەتی عیراق بەنیازی شەڕکردنەو شێوەی شەڕەکانیش سامناکترە لەوانەی پێشووتر بۆیە واچاکە ئێوە لەگەڵ حکومەتدا پێك بێن‌و ڕێك بکەون، لەوەڵامدا ئێمەش دەمانوت لەسەرچی ڕێکبکەوین؟، بەڵام وەڵامی ئەوان هەر ئەو وەڵامەبوو، کەواز لەشەڕو یاخی‌بوون بهێنن‌و وەرنەوە سەر کاروبارەکانی خۆتان!!.

ئێمە وەك لق‌و لیژنەی ناوچەی سلێمانی (پ.د.ك) کەوتینە خۆئامادەکردن‌و لە (١٩٦٣/٥/٢٥) بڕیاردرا کەدەبێت هەموو هێزە سەربازی‌و سیاسییە دەرکەوتووەکانمان، لەشاری بچینە دەرەوەو هەموو جۆرە ئیجازەو مۆڵەتەکان لەناو پێشمەرگەدا قەدەغەبکرێت‌و لەکاتی چاوەڕوانی هەڵگیرسانەوەی شەڕی سوپای عیراقدا بن، بۆئەوەش دەبێت هەموو چەکدارە کوردەکان لەڕیزەکانی پۆلیس‌و سەربازی حکومەتدا کەسەر بەڕێکخستنە نهێنییەکانی خۆمان بوون‌و ژمارەیان نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، دەبێت بەچەکەکانیانەوە هەموو توانایان بخەنەکارو بەشێوەی هەڵگەڕانەوە لەمەخفەرەکانیان لەناوشاری سلێمانی‌و شارۆچکەکانی دەوروبەری سلێمانیدا دەست بەسەر چەك‌و جبەخانەکاندا بگرن‌و دواتر بچنە بنکەی سەرچنار. لەو کاتەشدا چەند تێکۆشەرێك کەلەناو سوپادا بوون بەڕووتبەکانی نایب زابت‌و عەریف‌و نایب عەریف، کەبریتی بوون لە: ئەحمەد مەجید، شێخ قادر بەرزنجی، عوسمان، تۆفیق، جەبار دانران بۆئەوەی ئەو پلانە جێبەجێ بکەن‌و ڕێکخراوەکانی‌تریشمان هەمووی لەوپەڕی چالاکیدا بن بۆخۆئامادەکردن،

هەربۆ ئەو کارە من رۆژی (١٩٦٣/٦/٧) وەکو نوێنەری لقی سلێمانی چووم بۆ مەکتەبی سیاسی بەمەبەستی زیاتر لێدوان لەبروسکەیەك کەبۆمان هاتبوو دەیوت بەم زووانە، رژێمی عیراق بەهێزی زەمینیو ئاسمانیو بەهەموو جۆرە توانایەکیەوە هێرش دەکاتە سەرمان، بۆیە زیاتر ئاگاداری هەلوێستتان دەکەینەوە کەگەیشتمە گوندی (مالومە) خوالێخۆشبووان مامۆستای نەمر مامۆستا برایم ئەحمەدو کاك نوری شاوەیس لەوێ بوونو هەموو شتێکیان بۆ باسکردینو نامەیەکیان بۆ شەهید عەلی عەسکەری نووسی، کەمن نامەکەم گەیاندە شەهید عەلی عەسکەری ئەو لەئەزمڕ بوو لەگەلێدا لەسەرچاوەی کارێزەکەی ئەودیوی ئەزمڕ ماوەی دوو سەعات بەتەنیا دانیشتینو هەموو جۆرە نەخشەیەکمان دانا بەتایبەتی نەخشەکە زۆرینەی بۆ هێزە چەکدرەکانی حکومەت بوو کەسەر بەرێکخستنەکانی خۆمان بوون، هەر لەو کاتەدا سێ تۆپ لەسلێمانییەوە نرا بەو ناوچەیەوە، کێشای بەسەر رێگای ئەزمڕدا، هێندەشی پێنەچوو خوالێخۆشبوو تێکۆشەر نوری ئەحمەدی تەها-ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پ.د.ك کە لەسلێمانییەوە هاتبوو بەجێبێکەوە گەیشتو رایگەیاند؛ وەزع تەواو بەرەو ئینهیار دەڕوات پەلەبکەن لەکارەکانتاندا، لەگەڵ کاك عەلی لەسەر ئەوە رێك کەوتین کەشەوی (١٩٦٣/٦/١١\١٠) کاك عەلی بەهێزێکەوە سەعات ١٠ی شەو بگاتە گوندی (کانی بەردینە). ئێمەش وەك لقی سلێمانی هەموو ئامادە باشییەکمان تەواو بکەین، بەتایبەت بۆ گرتنی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنارو مەرکەزی ناحیەی سەرچنار، چونکە لەمەخزەنەکانی کارگەکەدا بڕێکی زۆر دینامیتو چەکێکی زۆر هەبوو، بۆیە بڕیارەکە وادرا کەهێزە چەکدارەکان لەسەرجەم بنکەکانی ناوشارەوە خۆیان بگەیەننە ئەو بنکەیەی کە لەسەرچناردا بوو، واتا لەناو شار بچنە دەرەوە.

شەوی (١٩٦٣/٦/٩) ئەندامانی لقی سلێمانیو لیژنەی ناوچەی سلێمانی لەماڵی دایکی جەمال بەختیاری خۆشنووس لەسەعات هەشتی ئێوارەدا کاتی

کۆبوونەوەمان هەبوو، زۆرینەی هەڤاڵانی لقی سلێمانی و ناوچەی سلێمانی کەپێکهاتبوو لەشەهیدان عەلی حەمدی، مەحمودی حاجی تۆفیق، مامۆستا ئەنوەر سەعید دارتاش، کەریم حاجی مارف، سمکۆ فەتحوڵڵا، دکتۆر کامل بەسیر لەگەڵ کاک بەکر جاهددا کەئێستا لەژیاندایە.

لەکۆبوونەوەکەدا باس لەوەکرا کەهێرش دەکرێتە سەر کوردستان، بەڵام نازانین شێوەی هێرشەکەی و چۆنە؟ مەکتەبی سیاسی زانیاری تەواوی لەبارەی ئەو هێرشانەوە نەبوو، نەلەبارەی شێوەکەیان. نەلەبارەی کاتی هێرشەکانەوە، ئەوەبوو لەکۆبوونەوەکەدا بڕیاردرا بروسکە بکرێت بۆ هەموو لیژنە ناوچەییەکانمان و بۆ هەموو ڕێکخراوەکانمان و هەندێك بنکەی پێشمەرگایەتیمان کەپەیوەندییان بەئێمەوە هەبوو لەگەڵ پێشمەرگەکانی ناوشارو لیژنەی سەرپەرشتی هێزی چەکداری حکومی کەپەیوەندییان بەنهێنی لەگەڵ ئێمەدا هەبوو، بۆئەوەی بەهەموو چەك و تفاقی پێویستی خۆیانەوە بگەنە بنکە بنکە شۆڕشگێڕییەکانی ئەو کاتەمان. هەروەها فەرمان لەهێزی پێشمەرگەوە وەربگرن بۆکاری پێویست، ئێمە وەکو لقی سلێمانی و لیژنەی ناوچەی سلێمانی بۆ چوونمان وابوو کەبەهێزترین خزمەتی شۆڕش لەوەدایە کەتابۆی بکریت. لەسەرەتادا لەشار بمێنینەوە لەبەرئەوە هێزو توانای شۆڕش لەڕووی جەماوەری و سیاسی و ئابوورییەوە، لەڕووی ڕاگەیاندن و لەڕووی ئەو زانیارییانەش کەدەربارەی کارەکانی دوژمن دەستمان دەکەوێت لەناوشار بەهێزتر دەبوو، بۆیە ئێمە بڕیارماندا وەکو ئەندامانی لق و لیژنەی ناوچەی سلێمانی لەشاردا بەنهێنی بمێنینەوەو بڕیاریش درا کەکۆبوونەوەی ئایندەمان لەماڵی کاك عەبدولڕەحمانی زەڕەنگەر بێت، بەڵام بەداخەوە نەگەیشتینە ئەو کۆبوونەوەیە، چونکە ڕووداوەکان تەقینەوە، هەر لەدواکاتی کۆبوونەوەکەی ماڵی دایکی جەمال بەختیاریشدا من بەکاك ئەنوەر دارتاشم وت: تۆ دوای کارەکان لەکوێ ببینین؟، وتی: جێگاکەمان زۆرخۆش و

ئەمینە لەگەڵ مامۆستا ئیسماعیل، مامۆستا حەمەبۆر، مامۆستا یاسین لەیاریگاکەین (ملعب) کەهاتیت بێگومان شەو درەنگ دێیت، وشەی نهێنیمان (ئەزمڕە)، بەڵام من بەهۆی سەرقاڵی زۆرمەوە نەمتوانی بچم بۆ لایان. بۆ بەیانی ئەو چوار قارەمانە لەوێدا دەستگیرکران و دواتر شەهیدکران. شوێنەکەیان نەئەمین بوو، نەخۆش.

لەسەعات چواری بەرەبەیانی ٩ی حوزەیرانی هەمان شەو درەنگانێك جاڕی (منع التجول) دراو دەستکرا بەتەقەکردن بەهەموو جۆرە چەکێك هەر لەتۆپ و دۆشکەوە تا چەکە بچووکەکان بەوەش زۆربەی بەرنامەی پەیوەندییەکانی ڕێکخستنەکانمان لەبارچوون، هەر لەپاش سێ ڕۆژیش من دەستگیرکرام.

هێزەکانی حکومەت لەهەموو شوێنەکانی کوردستاندا بڵاوببوونەوەو ناوچەکە ببووە ناوچەیەکی حەرەکاتی عەسکەری، چەند ڕۆژێك پێشتریش بەزیاتر لەسێ ڕەبایەی گەورەو بەدەبابەو بەدۆشکەو هاوەن زۆربەی دەوروبەری شار گیرابوو. لەڕۆژانی (منع التجول)یشدا بۆ هەموو گەڕەکێك هێزێکی گەڕۆك بڵاوببۆوەو بەدەبابەو بەزرێپۆش و بەزیلی عەسکەری و جێب و بەچەند لۆرییەکی بەتاڵەوە هەڵیان دەکوتایە سەر یەکە یەکەی ماڵانی شارو هەر کەسێکیان لەئەندامانی خێزانەکان بدیایە دەیانگرت و هەندێکیشیان لەڕێگا یاخود لەناو ماڵەکەی خۆیاندا دەکوشت، هەموو گیراوەکان کەزیاتر لەسێ هەزار کەس دەبوون، بران بۆ حامیە، کەئێستا جێگاکەی پارکی ئازادییە لەناو شاردا.

منیش لەگەڵ ئەو خەڵکەدا برامە حامیە، بەڵام هیچیان دەربارەی من نەدەزانی، ناردیانم بۆ هۆڵی قوتابی و فەرمانبەران کەبریتی‌بوو لەئەستەبڵی وڵاخەکانیان (واتە وڵاخی ئەسپ کەئەو سەردەمانە لەسوپادا هێزی سوارە هەبوو)، تفاق و ئالیکی ئەو ئاژەڵانەی تێدابوو. پاش ئەوەی کەماوەی چوار ڕۆژ هەموو بەندکراوەکان نان و خواردن و ئاویان لێقەدەغەکرابوو، وەزع زۆر

ناخۆشبوو، یەك یەك بانگ دەکران بۆ بەناو مەحکەمەی (وادی الموت) کەلەنزیك حامیەدا بوو، ئەو کەسانە لەوێ گوللەباران دەکران. دواجار پاش چەند رۆژێك خوالێخۆشبووان؛ رەفیق چالاك و سەرداری حەمەی ئەورەحمان ئاغا بانگ کران بۆ مەحکەمەی (وادی الموت) بەلام هاتنەوەو ئەوانیان رەمی نەکرد، کاتێك هاتنەوە بۆ هۆڵەکە من لەسەر خۆچووم بۆ لایان، بۆیان گێرامەوە کەلەسەر کورسییەك دایان ناون و چاویان بەستوونەتەوەو داوای وەسێت و هەموو جۆرە زانیارییەکیان لێکردوون، کەپێیان بڵێن، بەلام لەو کاتەدا بەبێ پێشەکی و یەکسەر وتیان؛ هەستن بڕۆنەوە هۆڵەکەتان. ئیتر خۆشمان نازانین بۆچی هیچیان لەئێمە نەکرد؟. لەگەڕانەوەماندا بۆ هۆڵەکە ئەوەندەمان بینی کەخوێنێکی زۆر ڕژابوو و ماکی کوشتنی خەڵك لەو جێگایەدا دیاربوو، شۆفلێش بۆ داپۆشینی کوژراوەکان لەکاردا بوون. هەر ئەو بەڕێزانە لەهۆڵەکەدا پاش گەڕانەوەیان گوتیان؛ لەوە دەچێ کوشتاری خەڵکی لەسلێمانیدا بوەستێ، پاش چوار رۆژ لەبێ نان و ئاوی بەندییەکان، چەند (قەسعە) ئەو تەشتەی خواردنی عەسکەرەکانیان تیادەدا، هێنرا بۆ هۆڵەکەی ئێمە کەژمارەمان ۷۰۰ کەس دەبوو. کەئەو خواردنە هات خەڵکەکە هێندە برسیبوو ئەو تەشتەی شلەکەی تێدابوو بەسەر پەنجاکەسەوە دەهات و دەچوو زۆریان خۆیان بۆ هەڵدەدا بۆئەوەی تەنیا پاروویەکیان بەربکەوێت کەزۆری بەسەر خەڵکەکەدا دەڕژا، زۆریان شوکوربوون ئەوەی بەردەم و چاویان کەوتبوو بیلێسنەوە، ئەوانەی لەم خواردنەیان خوارد توشی سکچوون و ئازارێکی زۆر بوون، کەدیارە ئەو خواردنە زۆر خراپ لێنرابوو. پاش چەند رۆژێك لەناو هۆڵەکەدا ئەسپێیەکی زۆر بلاوببۆوە، دەبوایە هەر لەهەمان هۆڵدا دەست بەئاو بگەیەنرایە. خەڵك هەبوو شەرمی دەکرد و کێشەی بۆ دروست دەبوو، هەر لەو رۆژانەدا بانگی چەند کەسایەتییەك لەسەرۆك و فەرمانگەکان کرا وەك؛ دکتۆر جەمال رەشید-کەسەرۆکی تەندروستی بوو، جەلال ئاغا

کەبەڕێوەبەری کارگەی چیمەنتۆ بوو، بەحەیزەران سەروچاویان پڕکردن لەخوێن، لەو کاتەدا ناهەموارەدا من لیژنەیەکم لەبرایان؛ (ڕەفعەت عەبدولڕەحمان، عەبدول سۆرانی عەبدول شێخ سالح، مامۆستا یوسف)و چەند هەڤاڵێکی دیکە پێکهێنا بۆئەوەی بکەوینە هەندێك کاری پێویست. هەروەها لەڕێگای (ئەنوەر محەمەد شا)وە کەکوڕی قۆنتەراتچییەکی عسکەری بوو لەحامیەو من دەمزانی لەڕێکخستنە نهێنییەکانی خۆماندایەو لەپەنجەرەی هۆڵەکەوە لەگەڵمان دەدوا، هەوڵمدا وەزعی دەرەوە بزانم، خێرا پێم وت: وەزعەکە چۆنە لەدەرەوە؟ وەزعی خۆشمانم بۆ باسکرد، کەئێمە عەسکەریی ئینزاریان کردووین و پێیان وتووین: سێ ڕۆژی کە لیژنەیەکی عەسکەری لەبەغداوە دێت بۆ لێکۆڵینەوە، دەبێت لەبەردەم لیژنەکە (وەلا) بۆ حکومەت بکەین. ئەگەر (وەلا) نەکەین ڕەمی دەکرێین، ئینجا لەبەرئەوەی نەك (ئەنوەر) نەیەتەوە پێم وت: کەئێمە وەك لیژنەیەکی حزبی بڕیارمانداوە کەئەم شوێنە سەنگەری پێشمەرگانەمان بێت و بەهیچ جۆرێك سەر بۆ ڕژێم دانا نەوێنین، ئەگەر هەڤاڵانمان بەو هەڵوێستەی ئێمە ڕەزامەندن با لەسەر (گردەکەی عەلی ناجی) ئێستاوە ئاگرێکی بچووك بکەنەوە. ئێمەش لەپەنجەرەی هۆڵەکانەوە ئەو ئاگرە دەبینین لەو بارەشدا کردنەوەی ئاگرەکە واتا ئێمە (وەلا) بکەین، نەکردنەوەشی پێچەوانەیەتی. بەڵام ئێمە لەسەر هەڵوێستەکەمان زۆر تووشی ئەشکەنجەبووین چونکە لەهۆڵەکانیترەوە گیراوەکان دەستە دەستە جوابیان دەنارد کەئەو بڕیارەی ئێمە هەڵوێستێکی گرانەو بەهۆیەوە خەڵکێکی زۆر دەکوژرێت. تەنانەت لەناو لیژنەکەشماندا لای چەند هەڤاڵێك ئەم باسە هیواش ببۆوە. هەروەها جوابم نارد بۆ براشیوعییەکان لەوانەی لەزیندابوون و لەڕێگای (کاك سدیق بارام)ەوە وەڵام بۆ هاتەوەو زۆر بەپرووسورانە وتی؛ دوو هەڤاڵی قیادیمان گیراوەو وتوویانە ئێمە هەردووکمان و حەوت ئەندامان ئامادەین لەجێبەجێکردنی ئەم بڕیارەدا هەمان هەڵوێستمان هەبێت. بەڵام لەسێ

هۆڵی‌تری ناو حامیەدا کەدەمانتوانی پەیوەندی لەگەڵ یەکدا بکەین ئامارم بۆهات کەچەند کەسێك ئامادەن هەمان رایان لەگەڵ ئێمەدا هەبێت. رۆژەکانیش رۆیشتن‌و دووریانە سامناکاکە بەرەو نزیکبوونەوە دەچوو. ئێوارەی دواین رۆژیش پێش ئەو رۆژەی بۆ هاتنی لیژنەکە دیاریکرابوو، لەپارچە سەموونێکدا کەکاك ئەنوەر گەیاندیە دەستم وتی؛ دوونامەم پێیە، یەکێکیان بۆتۆیەو لەلقی سلێمانییەوە هاتووە. ئەوی تریشمان بۆ کاك (جەمال حاجی مەجید فاسۆن)ە. نامەکانمان وەرگرت، جەمال چوو لەW.Cی بیخوێنێتەوە منیش لەهۆڵەکەدا بەنهێنی لەژێر بەتانیدا خوێندمەوە، نامەکەی من باسی دڵداری تێدایە، بۆیە بەپەلە خۆم گەیاندە W.C-یەکەو بەجەمالم وت؛ نامەکەی تۆ لای منە، ئەوەی لا تۆش نامەیەکە بۆ من هاتوو. مەیدڕێنە، لەگەڵ نامەکەشدا بەلاغێکی سەربازی بۆ من هاتبوو کەباسی لەشکاندنی سێ هێرشی حکومەت دەکرد لەئەزمڕ، کەتێیدا چەندین عەسکەر کوژرابووو چەندین کەسی کە لەکۆیە شەهیدکراون. ولاتە ئیشتراکییەکانیش بەباشە باسمان دەکەن..هتد ئەو کاتە شەهید عەلی عەسکەری لێپرسراوی هێزەکەی خەبات بوو لەکۆتەڵ. ئێمە هەر ئەو شەوە لەگەڵ هەڤاڵان بەلاغە هاتووەکەمان لەزیندانیەکانی هۆڵەکەدا لەسەر پاکەتی جگەرە بڵاوکردەوە، چونکە لەنامەو بەلاغەکەدا کەبۆمن هاتبوون وتبوویان خۆت چی دەکەیت ئەوە بەلامانەوە چاکە. ئێمەش لەگەڵ ئەو رایەداین کەدەبێت سەنگەرەکانمان لەزیندان‌و لەدۆڵ‌و چیاکانماندا وەك یەك بن. ئیتر بۆ رۆژی دوایی لیژنەکە هات، بەڵام ژمارەی خەڵکە گیراوەکە هێندە زۆربوون نەلێکۆڵینەوەیان بۆکراو نەئێمەشیان دووچاری هەڵوێستەکەمان کرد، تەنیا ناوی خەڵکیان بۆ بەربوون نووسی‌و دەستکرا بەئازادکردنیان.

ئێمە دوای بەربوونمان خۆمان گەیاندە لقی سلێمانی‌و دەستمان بەکارەکانمان کردەوە لەو کاروانە دووروودرێژەی لەپێناوی گەیشتنی

گەلەکەمان بەئازادیو دیموکراتیو مافە رەواکانیان درێژەی بەخەبات داوەو تائێستاش ئێمە لەسەر رێبازی خەباتی کوردایەتی بێوچانو بێ وەستان بەردەوامینو هیوامان وایە گەلەکەمان هەر لەژێر سایەی ئارامی ئاسوودەییدا بژی بەچاودێری (ی.ن.ك)و هەڤاڵی تێکۆشەر مام جەلالو بەهاوکاری سەرجەم هێزە سیاسییە تێکۆشەرەکان، بۆئەوەش پێویستە خەباتی کۆنو نوێ هاندەربێت بۆ یەك ریزی گەلەکەمان.

بۆ پاراستنی ئەم ئازادیو سەربەستییەی کەئەمرۆ لەکوردستاندا دروستبووە بەخوێنی هەزارەها شەهیدی نەمری گەلەکەمان لەسەرتاسەری کوردستان.

# (٩)ی حوزەیرانی ١٩٦٣
# چەپکە گوڵینەی خەباتی خوێناوی کوردەو
# پەڵەی رەشی ناوچەوانی داگیرکەرانە

غەفوور ئەمین عەبدوڵڵا

٣٩ساڵ لەمەوبەر، رۆژی (٩)ی حوزەیرانی ١٩٦٣ رژێمی داگیرکەری عێراق دوای ئەوەی بەهیچ جۆرێك دانی نەنا بەکەمترین مافی رەوای گەلەکەماندا، ئەو وتووێــژەی کەهــەبوو لــەنێوان ســەرکردایەتی ئەوکاتــەی شۆڕشــی کــورد، کەخوالێخۆشــبوو بــارزانی نــەمر رێبەرایــەتی دەکــرد، هــەڤاڵ مــام جــەلال نوێنەرایــەتی وەفدی کــوردی ئــەکرد لــەو گفتوگۆیــەدا کەلەگــەڵ رژێمــی بــەغدا خــەریکبوون، دەســتەی یەکــەمی بەعســیەکان بــۆ یەکــەمجار دەســەڵاتیان گرتەدەست و داوایان لەسەرکردایەتی شۆڕشی کورد کرد کەمەسەلەی کورد بەئاشتی چارەسەربکرێت، کەچی هەر لەگەرمەی ئەو وتووێژەدا بەعسیەکان بەفێڵ و نهێنی کەوتنەخۆ کۆکردنەوەو پڕچەککردنی سوپاکەیان و ناردنی بۆ کوردستان و دانانی بەسەدان رەبایەو بەربڵاوکردنی بنکە سەربازییەکان، بێگومان هەر ئەو گروهە کەلە (١٩٦٣/٢/٨) بەکودەتایەك رژێمی قاسمیان روخاند یەکسەر پیلانی لەناوبردنی شۆڕشی کوردیشیان ئامادەکردبوو، بەڵام هەمیشە سەرکردایەتی کورد کەباوەشی راستەقینەی بۆ ئاشتی کردبۆوە، داواکەی بەعسیانی بەغدایان نەگێڕایەوەو سەرۆکی وەفدی کورد بەڕێز مام جەلال لەبەغدا دانیشتنی زۆری لەگەڵدا کردن، لەبەرامبەر ئەوەدا لەناکاو (١٩٦٣/٦/٩)دا زۆر ناڕەوایانە لەهەموو لایەکی کوردستانەوە سوپای عێراق

بەتۆپ و تانك و فڕۆکەو هەموو جۆرە چەکێکی وێرانکەرو کوشندە پەلاماری کوردستانیان دا. بێبەزەییانە دەستیان کرد بەسووتاندنی بەرهەمی دانەوێڵەو سەدان خانووبەرە لەگوندو شارو شارۆچکەکاندا، ئینجا ئابلۆقەی شارەگەورەکانی کوردستانیان دا وەك سلێمانی کەبەبیری تەسکی خۆیان (بەسەری مارەکەیان دەزانی) و کەرکوك و هەولێرو خانەقین و کۆیەو دهۆك و ئاکرێ و شێخان. بێ پەڕاندنی تاقە گوندێك لەوانەی دەستیان دەگەیشتێ و کەوتنە وێزەی دانیشتوان و قەلاچۆکردنی خەڵکی بێدیفاع. هەر لەو کاتەدا زۆر ئازایانە وەفدی کوردی لەبەغدا دەستگیرکرابوون، کاتێکمان زانی مام جەلال لەبەیروتەوە ئەو پەلامارانەیت بەرەسمی گەیاندە هەموو ئاژانسەکانی جیهان. دوژمنانیش پتر قینی رەشی خۆیان بەسەر هەموو چینەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری ستەم دیدەدا داباران، شاری سلێمانی شاری بەرەنگاربوونەوەو سەروەری لەو رۆژەدا ناخۆشترین بەلاّ و کارەساتە دڕندەکانی ئەو سەردەمەی بەسەر داباری.

## کوشتن و رەشبگیر لەسلێمانی و دەوروبەری

بەیانی زووبوو، دنیا روونـاك نەبووبووەوە بەهەلیکۆپتەر دەنگی راگرتنی هاتووچۆ بەبڵندگۆیەکی دەنگ کپ و منگن جاڕیدا هەرچی بێتەدەرەوە لەماڵ گوللەباران دەکرێت، هەموو سەرجادەو سەرکۆلاّن و کوچەکانی ناوشار بەتانك و زرێپۆش تەنرابوو، بەهەزاران مەفرەزەی سەربازی بەزیل و جێب قیادەوە کەوتنە سەرجادەو ناوشارو پەلاماری ماڵانیاندا، کەزۆربەی خەڵکی هەر لەخەودا بوون، راپێچی ئیستەبڵەکانی حامیەی سلێمانی کران.

## ئەوانەی بەر ئەو شاڵاوە کەوتن

کەسانێك کەگوێیان لەبانگەوازەکـە نـەبوو، چووبوونـە سـەرکاری خۆیـان، لەڕێگەو ناوبازاڕ تەقـەیان لێکردبوون و شـەهیدیان کردبوون، لەوانـە؛ هـەر بـۆ نموونە، نەك سەرژمێرکردن:

*پیـاوێك بەناوی عوسمـانی جۆڵا لەگـەڕەکی چوارباخ کەبۆ حـەمام ئـەچوو تەقەیان لێکردن، بریندارپان کردبوو، رایکردبووه ماڵی حاجی رەزایـەکی پیری ریش سپی هەرچەندە پاڕابوونەوە وازیان لێنەهێنابوو بەبرینداری لەسەربانی ماڵەکە شەهیدیان کردو تەرمەکەیان فڕێدایە کۆڵان.

*شەهیدکردنی نامدار، چاپچی بوو لەنزیك مزگەوتی گەورە.

*شەهیدکردنی لاوێك بەناوی عومەر مینەمیتو لەبەردەرگای خۆیان.

*پـەلاماردانی مـاڵان و هێنانـەدەرەوەی هـەزاران کـوردی بێچـەك و بێتـاوان بەجلی نووستن و بیجامـەوە راپێچکران بۆ ئەسـتەبڵەکانی حامیـەی سـلێمانی کەشـوێنی وڵاخ بـوو، بەبەنگەڵـەکانی حامیـە نـاودەبران، چـەند رۆژێـك نـان و ئاویـان لێبڕیـن لەبرسـانا ناچـاری خواردنێکـی پاشمـاوەی وڵاخـەکان ببـوون! لەبەرئەوەی هیچ خواردنێکیان نەئەدانێ.

*لەسـەرچنار شـەهیدکردنی لاوێـك بـەناوی رەحیمـی عەینـە جگەرخانـەی لەوێ هەبوو لەسەربانی دوکانەکەی ئەنووست، خەبەریان کردبووەوە و داوایان لێکردبوو تف لەوێنەی ئەو پێشمەرگانە بکات کەهەڵیواسیبوون جوێنی نەداو تفی لێنەکردبوون، بەقەمچە شەهیدیان کردو تەرمەکەیان بەست بـەتانکێکداو لەحامیەی سلێمانی فڕێیاندا.

*شەهیدکردنی نوری عەریزەنووس لەسەرئەوەی جوێنـی نـەدا بـەبارزانی و سەرکردەکانی کورد لەشۆڕشی ئەیلول ١٩٦١.

*شــەهیدکردن و زیندەبــەچاڵکردنی کــەمالی حەمــەی فــەرەج ئەفــەندی بەزیندوویەتی بەشۆفڵ گڵیان کرد بەسەریا.

*دەستگیرکردنی چوار مامۆستا لەیاریگای سلێمانی کەخۆیان هەموو یاریزانی تۆپی پێ و باسکەو بالەو گۆرەپان و مەیدان بوون و چوار ئەندامی چالاکی پارتی و یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان بوون ئەوانیش شەهیدان؛ مامۆستا یاسین حەمە سالح کەباشترین یاریزانی کوردستان بوو. مامۆستا محەمەدی حاجی سالح ناسراو بەحەمەبۆر-یاریزانی باسکە. مامۆستا ئەنوەر سەعید دارتاش برای کاک فەرەیدون دارتاش، کەلێپرسراوی لقی سلێمانی (پ.د.ك)و پیاوێکی نیشتمانپەروەرو ناسراوی ناوپارتی بوو. مامۆستا ئیسماعیل ئیبراهیمی بەلوعەچی و بەقۆڵبەستراوی لەیاریگەی سلێمانییەوە بردبوونیان بۆ حامیەی سلێمانی، لەڕێگەو لەناو زیلی سەربازیدا سرووودی (ئەی رەقیب) یان گوتبوو هەر لەوێدا پێکەوە گوللەبارانیان کردن، مامۆستا یاسین ویستبووی دەربازبێ، بەدۆشکەی دەبابە شەهید کرا، هەرچوار شەهید پێکەوە خرابوونە چاڵێکەوە لەگفتوگۆی شوباتی ١٩٦٤دا، لەگەڵ شەهیدانی‌تری (شیووی مەرگ-وادی الموت) تەرمەکانیان دۆزرانەوە.

*شەهیدکردنی مامۆستا حاجی باقی لەسەرئەوەی دووربینە شکاوێکیان لەماڵەکەیدا دۆزیبووەوە کەئەبوو ماڵەکەی پڕبوایە لەئامێری فەلەکەی ناوبراو ئەندامی حزبی شیوعی عیراقی بوو.

*شەهیدکردنی پیاوی ناسراوی شارو نیشتمانپەروەر نامیق مستەفا ئاغا لەلایەن عەریف حەمید ناوێکەوە لەحامیەی سلێمانی.

*شەهیدکردنی عەلی ئاسنگەر لەماڵی خۆیدا لەکاتێکدا منداڵە ساواکەی لەباوەشدابوو.

*دووبرا بەناوی عەبدوڵلاو محەمەدی حاجی عەبدولڕەحمان لەئیبراهیم پاشا لەبەردەمی دایکە پیرەکەیدا، دواتر لەحەوشەی ماڵەکەیدا ناشتیان.

*شەهیدکردنی دوو برا بەناوی محەمەدو وەهاب کە هەر لەمزگەوتی جولەکان نێژران.

*لەبەرخانەقا (حەمەڕەشیدی لەگولان) شەهیدکرا بەقەمە چونکە نەیتوانیبوو سواری زیلە عەسکەرییەکە بێت، بەقەمە سەریان خستبوو لەناو زیلەکەدا شەهید بوو.

*شەهیدکردنی شێخ عەبدولی بابەگورون و شەریکەکەی عومەری حاجی یونس، چایخانەیان هەبوو لەکانێسکان. هەروەها منداڵێك بەناوی بابەعەلی خزمی مامۆستا شێخ فاتیح لەحامیە شەهیدکرا.

*گوللەبارانکردنی حەمە دەمە لەبەرچاوی کۆمەڵێك کەسدا لەوانە؛ مامۆستای کیمیا کاك فایەق عارف، چونکە جنێوی نەدابوو بەسەرکردەکانی شۆڕش.

*شەهیدکردنی ڕەفیق کونجرینی گوایە پردی عەلیاغای رووخاندووە، تەرمەکەیان لەحامیەی سلێمانی فڕێدابوو.

*شەهیدکردنی ئەحمەد کەریم (ئەحە نەوتە) لەدێی قرگە لەگەڵ مەلا ڕەشید ناوێك کەتەمەنی ۹۰ساڵ بوو، لەماڵەکەی خۆیداو خانووەکەیان بەسەرا سوتاندن.

*لەسەر ڕێگای سلێمانی-دوکان تیپێکی سەربازی بەسەرکرایەتی ئەفسەر نەجیب کشمولە ناوێك، دێهاتەکانیان سووتاندو منداڵێك لەناو بێشکەداو لەژوورێکدا دەبێ، سەربازێك ئەیەوێ ڕزگاری بکات، ئەفسەرەکە نایەڵێت ڕزگاری بکات و هەر لەناو بێشکەکەدا دەبێ بەزووخاڵ و ئەفسەرەکە دەبێ ئەمە تووله مارە! بابسووتێ.. (فرخ الحية).

*شەهیدکردنی شۆفێرێکی ماڵی حەمەی ئەوڕەحماناغا، کەبەداخەوە وەك زۆر شەهیدی‌تر ناوەکەی نەزانراوە.

*چەند فەقێیەکیان لەمزگەوتی حاجی حان شەهید کرد، کەئەوانیش تائێستا گومناون، داوا لەیەکێتیی زانایانی کوردستان دەکەین کەبگەڕێن بەدوای ناوەکانیاندا.

## لەشاری کۆیە

گرتنی خەڵکانێکی زۆر لەکاسبکاران و فەرمانبەران و مامۆستایان، هەندێ لەوانە؛ گوللەبارانکران لەکاتێکدا بەسترابوونەوە بەپایەکانی دوکانەکانی ناوبازاڕی کۆیە، لەوانە؛ مامۆستایەکی ناوەندی کەناوەکەی نەزانراوە -برای مامۆستا جەمال حەوێزی-.

*لەدێی سیارەی دەربەندیخان زەعیم سدیق مستەفای خوێنڕێژ، ٣٣ کەس بەمەلاکەوە ریزکردو دواتر گوللەبارانی کردن. لەکاتێکدا مەلاکە قورئان ئەبات بەپیر زەعیم سدیقەوە، بەڵام ئەو شەقێك لەقورئانەکە ئەداو پەڕەکانی لەو ناوەدا بڵاو ئەکاتەوە.

*لەبادینان لەئەشکەوتی سولیاو و ئەشکەوتی دەکان بەکۆمەڵ خەڵکێکی زۆر لەژن و ماڵی کوردی مەسیحی کەخۆیان لەو ئەشکەوتانەدا شاردبۆوەوە گوللەباران کران و ئاگریشیان تێبەردان.

*ئەم کوشتن و بڕینە دوای ئەوە ئەنجامدرا کەزەعیم سدیق مستەفا ئامری لیوای سوپاکەی عیراق، بەسەربازێکی زۆرەوە هێرشی بردە سەر چیای ئەزمڕو هێزی پێشمەرگەی کوردستان شکاندیانن و بەسەرشۆڕی گەڕانەوە ناوسلێمانی و بەپەلە لیژنەیەکیان دروستکرد بەناوی ئەندامانی دادگاوە کەبەدادگای (محکمە الوادی) ناسرابوو، لیژنەی دادگا پێکهاتبوو لە؛

١-لیوا زەعیم سدیق مستەفا-سەرۆك.

٢-عەقید جاسم-ئەندام.

٣-مقەدەم فەیسەڵ، کەفسەرێکی خەڵکی باقووبە لەئەندام.

٤-حاجی عەبدولڕەزاق سەید مەحمود متەسەڕفی سلێمانی-ئەندام.

٥-دکتۆری عەسکەری محەمەد عەلی حسێن-ئەندام.

لەگەڵ گەلێك ئەفسەری سەربازی کەناوەکانیانم. هیوادارم کەهەموو ناوەکانیان بدۆزرێتەوە، وەك تاوانبارانی جەنگ دەستنیشان بکرێن. (٩)ی حوزەیرانی ١٩٦٣، رۆژی ئەو تاوانانەیە کەسێ رۆژی بەتوندی بەردەوام بوو، من لەگەڵ چەند هاورێیەکمدا لەماڵی برای تێکۆشەرم مامۆستا عارف عەبدوڵلا کەبەعارف عەبۆل ناسراوە لەماڵی ئەوان لەگەنجینەیەکدا خۆمان شاردبۆوە کەلەرێگای برادەرێکەوە ناوی شەهیدەکانمان بۆ ئەهات ئەوەندەی لەبەردەستدابوو تۆمارم کردوون. هیتریش زۆر ماون.

لەدوای ٩ مانگ بەسەر ئەو رۆژەدا موشیر عەبدولسەلام عارف کەسەرۆکی عیراق بوو لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣دا کودەتای بەسەر بەعسیەکاندا کرد، کەبەعسیەکان بە(ردە تشرین) ناوی ئەبەن. پەلاماری حەرەس قەومیەکانی بەعسیدا لەبەغداو دەستیگرت بەسەر دامودەزگاکانیاندا، لەپاش ماوەیەك بەیانێکی بلاوکردەوە بەناوی (اقرار الحقوق القومیه لاخواننا الاکراد). ئەوەبوو لەمانگی شوباتی ١٩٦٤دا شەڕ لەنێوان شۆڕشی کورد بەسەرۆکایەتی بارزانی و سوپای عیراقدا راگیرا.

خەڵکی کەوتنە گەڕان بەدوای تەرمی شەهیدەکانیاندا لەهەمولایەکەوە بەتایبەتی لەحامیەی سلێمانی و دەوروبەری کەئێستا بووە بەپارکی ئازادی، زۆر لەو شەهیدانە دۆزرانەوە کەڕۆژانە خەڵکێکی زۆر بەدوای تەرمی شەهیدەکانیاندا ئەگەڕان لەشیوی مەرگ (وادی الموت). منیش رۆیشتم پیاوێکی پیری کرێکاری سەمونی حامیەبوو، پێم وت مامەگیان چوار مامۆستایان هێناوە بۆ ئێرە، ئەو گوتی؛ من هەر ئەوەندە ئەزانم چوار کەسیان هێنا دەستبەسراو، گۆرانی (ئەی رەقیبیان ئەوت) ناوم مەبە وان لەو چاڵە داپۆشراوەدا یەکێکیان رای کرد، دەبابەکە کوشتی و رایان کێشایەوە ناو چاڵەکە. منیش خێرا چەند بەردێکم بەدەوری چاڵەکەدا دانا و چووم ئاگاداری خوالێخۆشبوو کاك فایەق سەعید قەسابم کرد، لەگەڵ هەندێ لەکەسوکاریان بۆ

بەیانی چووین بۆ دەشتی حامیە کامێرایەکی کۆداکم بە دوو فیلمەوە لەگەڵ خۆمدا برد، هەرچەند وتیان ئەمە مەکە، من گوێم پێنەدا کامێراکەم بردو بەنهێنی هەر لەچاڵەکەوە هەڵکەندن و دەرمێنانی ئێسقانەکانی هەر چوار مامۆستای شەهید هەردوو فلیمەکەم تەواوکرد، دوا وێنە کەناشتمانن بەبرادەرێکی خۆم وت وێنەیەکم بگرە باقی هەموو وێنەکان خۆم گرتوومن و پەڕۆیەکم دابوو بەسەر کامێراکەداو ئەم وێنانە ٢٩ساڵ شاردمنەوە هەتا راپەرینی پیرۆزی ساڵی ١٩٩١و لەساڵی ١٩٩٢پێشانگایەکم لەقوتابخانەی سورکێو کردەوە، بۆیەکەمجار وێنەکانم لەو پێشانگایەدا نیشاندا، گەلێك لەپارت و رێکخراوەکان و خەڵکی شار سەردانیان کردو جێگای سەرسوڕمان و گرنگی ئەم قایمکاریەم بوون، هەتا لەبیرمە خوالێخۆشبوو کاك فایەقی قەساب وتی: مامۆستا غەفوور تۆ لەکوێوە ئەو وێنانەت گرتووە، چونکە وێنەیەکی خۆیم گرت لەکاتێکدا دایکی شەهید مامۆستا یاسین خۆی‌دابوو بەسەر گۆڕەکەی یاسیندا، کاك فایەق ئەگریا، منیش وێنەیەکم گرتن و لەبیرمە خوالێخۆشبوو حاجی حەمەساڵح باوکی شەهید حەمەبۆر بەنهێنی پێی‌وتم: وێنەیەکم لەگەڵ کاکە حەمەی کوڕمدا بۆ بگرە چونکە وێنەمان پێکەوە نییە منیش گوتم: بەسەرچاوو وێنەکەم بۆگرت.

رێکخراوی میدل ئیست وۆچ کەبەڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی ناسراوە کەنوێنەرەکەیان سوزان-ی ناوبوو لەگەڵ ئافرەتێکی هاوڕێی هاتن پێشانگاکەیان بینی. زۆرێك لەوێنەکانی نیشانەکردو هات بۆ ماڵەوە لەگەڵ مەترجمێکدا دووجار هاتن داوای لێکردم کەئەم وێنانەی بدەمێ بیبات بۆ ئەمریکا تابتوانن کتێبێك دەربکەن و مقابەلەکانی من لەگەڵ وێنەکان پێکەوە لەو کتێبەدا بڵاوبکەنەوە منیش ئەوەم بەهەلزانی کەئەو کارەساتە خوێناوییە بگات بەهەموو جیهان، وێنەکان و فلیمەکانی برد بۆ نیویۆرك لەساڵی ١٩٩٢، دوای چەند ساڵێك کەمن لەئەڵمانیادابووم لەساڵی ١٩٩٨دا برای بەڕێز

مامۆستا قادر ڕەشان کەلەئێستگەی دەنگی کوردی لەئەمریکا بەرنامەی هەبوو تەلەفۆنی بۆ ئازادی کورم کردبوو لەڕۆژوێل پێی‌ڕاگەیاندبوو کەناڵی فرجینیای ئاسمانی بکاتەوە، ئەو وێنەو زانیارییانە ئەکات کەباوکت داویەتی بەڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی، کەلەسەر مافی مرۆڤ بەرگری ئەکات، پاشان کتێبەکە لەژێرناوی (کوردستان لەسێبەری مێژوودا-KUDISTAN IN THE SHADOW OF HISTORY) بەهەموو جیهاندا بڵاوکرایەوەو نرخەکەی ١٥٠دۆلاربوو، من لەلەندەن کتێبەکەم بینی بەڵام بەداخەوە بۆم نەهاتەوە ئەڵێن کەبەڕێز د.بەرهەم ئەحمەد ساڵح چەند دانەیەکی هێناوە چونکە ئەو کاتەی کاک قادر ڕەشان تەلەفۆنی کردبوو بۆ ئازاد کاک بەرهەم لەوێ بوو، ئەم کتێبە گەلێك لەوێنەکانی سەرکردەی شۆڕشەکانی کوردم کەبۆ ناردوون تیایەتی.

لەسوید نوسخەیەك لای هاوڕێی کوڕی ڕەئیس مستەفا هەیە کەئاگادار کرام کەئێستا لەئەڵمانیاش پەیدائەبێ. من ئومێدئەکەم کتێبەکە بگاتە دەست خوێندەوارانی کورد لەکوردستانی ئازاد.

لەدواکاتدا سوپاس‌و ڕێزم بۆ هەموو ئەو گۆڤارو ڕۆژنامەو کەناڵە تەلەفزیۆنانەی ئەم زانیارییانە بڵاودەکاتەوە. من ئەم کتێبەم بەپەسەندزانی کەئەم زانیارییانەیان بۆ بنووسم‌و داوا لەئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی ئەکەم کەلەڕۆژی ٩ی حوزەیرانی ئەمساڵدا پەیکەرێك بەناوی شەهیدانی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣-وە لەپارکی ئازادی دروستبکات کەڕەمزێك بێ بۆ هەموو ئەو شەهیدە سەربەرزانە، دیارە کەشارەوانیی سلێمانی لەژێر ڕێنمایی هەڤاڵ مام جەلال حامیەی سلێمانی‌و شیوی مەرگی گۆڕی بەجوانترین شوێنی شارو ناوی لێنا پارکی ئازادی. ئەم پێشنیازەش پەسەندئەکات‌و کتێبێکی تایبەتی لەسەر ئەو ڕۆژە ڕەشە بڵاوئەکاتەوە.

# ترسناكترين لاپەڕەی مەرگەساتی شار

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

گێڕانەوەی پەلاماردان و دیمەنێکی هەرەدڵتەزێن و کسپەهاوێژ کەنزیکەی چل ساڵ لەمەوبەر روویدابێت ئەڵبەتە یادەوەرییەکان دەقاودەق و لەسەدا سەد مەبەست ناپێکن، بەڵام لەئەنجامی پرس وڕادا لەوانەیە شتێك لەو ڕێژەیە نزیکمان بکاتەوە. ئەوەی خۆی لەناو تەنگژەکەدا ژیابێت بێگومان دەتوانێت ئەوەی دیویەتی بەویژدانەوە بیخاتەڕوو.

لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا ترسناکترین لاپەڕەی مەرگەساتی خوێناوی و تاڵترین وەیشوومەی شەڕو هەراو تۆقاندن سەرانسەری شاری پێچاپێچەوە جۆگەلەی خوێنی بەناهەق ڕژاو زەبروزەنگ و داپڵۆسین و سوکایەتی بەهاووڵاتیان و پێشێلکردنی مافی مرۆڤی کورد، بەهێزترین دیاریی بۆگەن نۆبەرەی فەرمانڕەوایی بەعسییە تێکدەرەکان بوو:

*بادوور نەڕۆیین بیخەینەڕوو — خووی فاشیستانی رابوردوو*

*نۆی حوزەیرانی شەست و سێ — بەر کوڵیان بوو دایان دەرسێ*

*شاری سلێمانیی خەمڕەوێن — هاتن کردیان بەگۆمی خوێن*

*بەدەستووری زەعیم سدیق — گەلی کوردیان کرد بەحەریق*

*ڕەشبگیرێکیان دروستکرد — سەدان کەسیان بۆ مردن برد*

*خێزان نەما ڕەشپۆش نەبێ — چرای ژینی خامۆش نەبێ*[1]

لەو ڕۆژەدا ئەوەی لەویژدانەوە دووربوو، ئەوەی هەست وەری نەدەگرت و بەخەیاڵدا نەدەهات، ئەوەی تەمەنی مێژوو بۆی نەگێڕابووینەوە ئێخەی

گرتین و بەسەر شاردا هات. شالاوێکی پڕلەقین و ڕەگەزپەرستی چاوە سوورەکانی کردەوە. ئێشەکان تەشەنەیان کردو برینەکان بەرەو قوڵاوی و کسپەو فرمێسک و سنگ کوتانیان لەبۆتەی ئاخاوی و پەژارەی خەستدا یەکانگیربوون. بەفەرمانی هۆلاکۆی سەردەم زەعیم سدیق مستەفای تاوانبارو گۆڕبەگۆڕ سەدان دایك و باوك و جگەرەیان بڕاو سوتا، سەدان منداڵ هەتیوبار کەوتن، سەدان خوشك و برابەرگی ڕەشپۆشیان پۆشی، کارەساتی نوێی حوزەیرانی ١٩٦٣ ئەو زامە دەمکراوەیە بوو ئێشەکەی تێکڕای خێزانەکانی شاری گرتەوە، بەکورتی پرسە لەهەمووانی پرسی.

لەچێشتەنگاوی ئەو ڕۆژە شوومەدا، کەدەم و چاوە ترسناکەکان لەناکاو بەناو شەقام و کۆڵانەکاندا بڵاوببوونەوە، تۆوی زیرەو ترسیان دەوەشان، ئێمە لەوکاتەدا ماڵمان لەگەڕەکی جولەکان بوو، کاتێ مەفرەزەکان بڵاوبوونەوەو دەستیان کرد بەتەفتیش کردن لەیادمە بەس خۆم و دایکم لەماڵ بووین پەنام بردە بەر قورئانەکەم و بەدەنگی بەرز دەستمکرد بەخوێندنەوەی بەمەبەستی ئەوەی ئەوان شەرم لەو قورئانە بکەن و عەزێتمان نەدەن، کاتێ خۆیان کرد بەژووردا یەکسەر پشت ملیان گرتم و پاڵێکیان پێوەنام، قورئانەکەم لەدەستپەڕی و بەژوورەکاندا گەڕاندمیان، چی کەل وپەل هەبوو بەشەق و بەنێزە تێکەڵ و پێکەڵیان کردو هەواڵی گەورەکانیان دەپرسی، ئیدی ئەوەی گەنج و کامڵ بوایەو بەردەستیان بکەوتایە بەجوێن و تێهەڵدان دەیاندایە پێش و ڕەوانەی گرتووخانەیان دەکرد. تەق وتۆق و نیشتنەسەر خەڵکی کارێکی ئاسایی بوو. لەو دەمەدا دانیشتوانی گەڕەکی جولەکان هەڵوێستێکی دیارو مەردانەیان هەبوو لەپێشوازی و شاردنەوەو ڕێپیشاندانی ئەو هاوولاتیانەی لەگەڕەکەکانی ترەوە ڕایان دەکرد یاخود لەکونی زێرابەکانەوە دەهاتن لەوێشەوە خۆیان دەکرد بەشیوی جولەکاندا بەترس و لەرزەوە دەربازدەبوون بەرەو کانی گۆمەو تانجەرۆ دەڕۆیشتن. بەم جۆرە ئەو ڕۆژە شیوی جولەکان

ناونرا بەشێوی رزگاری، گەر یەکێ سەرنجی بدایە هەمیشە لەناو بنەتوترك و چاوبازە بێشەڵانەکانیدا کەسانی خۆشاردەوەبوون، دەبینی. واشەکانی بەعس ئەو گوزەرەشیان دۆزییەوەو لێی نیشتنەوە، دوابەدوای دانانی رەبایەکانی سەرگردی شێخ فەتاح و سەر قوتابخانەی سەرشەقام[٢] پاشان رەبایەو چەپەری تریان لەپردی عەلافان و گۆرە جولەکەکان دانا و ئەو ناوەشیان بەتەواوی کۆنترۆڵ کرد. ئەوەی لەگەرەکی ئێمە ناوبانگی بەرەڵایی و بێبەزەیی هەبوو (کەچەڵ) و (حەمەدرێژ)بوون. کەچەڵ نائیب عەریفێکی مرومۆچ و بۆرەکەڵەو کوڵەبنەی ناشیرینی بێئامان بوو. کوشتن و ئاوخواردنەوەی لاچوونیەك بوو. هەرچی سەیری بکردایە یان دەیگرت یان لێیدەدا. حەمەدرێژیش کەرەئیس عورەفایەکی تازەپێگەیشتووی کەڵەگەت بوو کابرایەکی نارەسەن و داخ لەدڵ و خوێنرێژبوو مەلاشووی بەپارووی بێبەزەییانە هەڵدرابووەوە. لەگرتن و کوشتن و داپڵۆسینی هاووڵاتیاندا لەریزی پێشەوەبوو، کەچەڵ و حەمەدرێژ تفەنگی سیمینۆف و دەمانچەشیان پێبوو، ئەو دوو گورگە گەلەگورگێکیان بەدواوەبوو.

## کوشتنی دووبراکە

لەم رووەوە بەرێز مامۆستا غەفوور ئەمین لەنووسینەکەیدا ئامارەی پێکردوون، بەڵام من و ئەو دوو شەهیدە کورانی گەرەکێك بووین و لەنزیکەوە دەمناسین، لێرەدا لەگەڵ فرمێسکدا بەسەریان دەکەمەوە. دووبراکە گەورەکەیان بەناوی (حەمەجگەرە بەلێو) ئەوی تریشیان بەناوی (عەبدولوەهاب) کورانی مام عەزیزی درەڵەیی و کرێچیماڵی حاجی شێخ ساڵحی کارێزەبوون. مام عەزیز شێلمی کوڵاوی دەفرۆشت و کورەکانیشی یارمەتییان دەداو کرێکاریشیان بەدەمەوە دەکرد. ئەو رۆژە لەپشت ماڵەکانەوە کەچەڵ و تاقمەکەی دوایان دەکەون لەنزیك شیوەکەدا دەیان گرن. ئەوان

دەپاڕێنەوە کەنەیان کوژن بەڵام کەچەڵ بەگولله وەڵامی دانەوە. یەکەم فیشەك دەنێت بەحەمەجگەرە بەلێوەوەو دەیخات، عەبدولوەهابی برایشی دەداتە شیرەی گریان و هاوارو براڕۆ، خۆی دەدات بەسەر براکەیدا کەچەڵ نۆ فیشەکەکەی‌تر دەنێت بەعەبدولوەهابەوە هەردووکیان خوێنیان تێکەڵ دەبێت. دوای تەقەکان، پیرانی گەڕەك دڵیان داخورپا و کەوتنە مقۆمقۆ یەکسەر کەچەڵ وەك شمڵی شەڕ دەرکەوت و دەسکێ تەروی خوێناوی بەدەستەوە بوو. خوالێخۆشبووان ئەحمەدی مەلا عەلی و حەمەبۆر گەبەیی و حاجی قادری شیر ئەحمەد حەیران کەلەپیرانی گەڕەك بوون، ئەحمەدی مەلاعەلی کەمێك عارەبی دەزانی و لەکەچەڵ گەیشت کەدوو برای کوشتووە دەسکێ تەروی لەخوێنەکەیان هەڵکێشاوە، خەڵکەکە وەکو خۆڵ و دۆیان بەسەردا کرابێت دۆش دامان، بۆ بەیانی سەیارەیەکی ئیسعاف هات و تەرمەکانی[٤] هەڵگرتەوە و بردنی بۆ نەخۆشخانە. هەر ئەو ڕۆژە بۆ نیوەڕۆ خاڵە عومەر سیتەکی ڕەحمەتی کەخاوەنی عارەبانەی تریشقە (یەك ئەسپی) بوو چوو بۆ خەستەخانە و جەنازەی هەردووکیانی هێنایەوە بۆ مزگەوتی گەڕەکی جولەکان و ناسرانەوە. لەو دەمەدا باجی شەمسە و مامە عەزە دایك‌وباوکی هەردوو برای شەهید گەیشتنە ئەوێ بوو بەشین و شەپۆڕو قوڕپێوان، چەندان پیرو منداڵ کۆبوونەوە. لەمزگەوت کفن و کێلی ئیحتیات هەبوو شۆران و کفن کران خستیاننە دارەمەیتەوە بیانبەن بۆ گۆڕستان بەڵام دوژمنانی مرۆڤایەتی کەچەڵ و حەمەعارەب و تاقمەکەیان وتیان قەدەغەیە. ئەوانە ناپاك و یاخیی بوون بڕۆن فرێیان بدەنە شیوو زێرابەوە، بۆ دانەمان و پەککنەکەوتن جاران کەسانی خێرەوەمەند بەتۆپ قوماشی کفن (خام و بلووری) و کێلەبەردی گۆڕیان دەکڕی و بەوەقف لەمزگەوتەکاندا دایان دەنا. ئاوەها لەو تەنگانەیەدا دەوری خۆیان دەبینی. ناچار پاچ و بێڵ و خاکەناز کۆکرانەوە، پیرو مێردمنداڵ لەحەوشەی مزگەوتەکەدا کەوتنە چاڵ هەڵکەنین لەشێوەی گۆڕدا بەپەلە

نێژران و شاردرانەوە، ئەو ناوە چۆڵ کرا، پوورە شەمسەو مام عەزیز هەمیشە سەردانی گۆڕەکانیان دەکردو دەگریان بەو تاسەیەوە لەسالأنی دواتردا مام عەزیز لەرزۆك و بێتاقەت بوو بەئێشەوە سەری نایەوە، پوورە شەمسەیش بەو ئازارو سوێیەوە تاکو ئەمڕۆیش هەر ماوە. هەر لەو ڕۆژانەدا بوو پیرەمێردێکی گەڕەکەمان بەناوی دەروێش کەریم خورشید ئەمری خوای کرد لەگەڵ جەنازەکەیدا چووین بۆ گۆڕستانی گردی شێخ فەتاح لەوێ جەندرمەکانی ڕەبایەکە وتیان؛ ڕێگە نادەین بەناشتنی بەچ مەعلوم موتەمەرید نییە، ناردینیان بۆ تەسکەرەکەی، خێرا هێنامان هەر بڕوایان نەکرد تاکفتەکەیان هەڵوەشان ڕووانیان پرچی درێژەو بەتەمەنە ئینجا ڕێگەیان دا تا بشارێتەوە، دیسان لەگەرمەی شالأوی ئەو ڕۆژانەدا ئافرەتێك بەناوی جەیران حەمە ساڵح و کچەکەی بەناوی نەسرین سەعید نانەبەرەیەك نان و هەندێ ماست و دۆیان پێبوو، لەنزیك کانی ئارەق خۆرەکانی ئەوبەر شیوی جولەکانەوە دەڕۆیشتن کەچی لەپڕ لەڕەبایەکەی سەر قوتابخانەی سەر شەقامەوە تەقەیان لێکراو سەرو گوللەیان بەرکەوت هاوارو ناڵەو گریان ئەوناوەی گرتەوە، قادر زۆرابی ڕەحمەتی عارەبیزانێکی چاك بوو چووەلای سەربازەکان و تێی گەیاندن کەئەو دایك و کچە بریندارن با ببرێن بۆ خەستەخانە، ئەوانیش موافەقەتیان کرد، خێرا عومەر سیتەکی خستنیە سەر عارەبانە تریشقەکەی و ئازایانە گەیاندنییە جێی مەبەست و تیمارکردن بەخۆشییەوە ئێستایش ئەو دایك و کچەماون بەلأم شوێنەواری گوللەکە ژیانی لێشێواندوون. هەر لەدرێژەی ئەو ڕۆژە توشانەدا زەعیم سدیقی خوێنڕێژ بەخۆی و هێزێکەوە دەچێت ئابلۆقەی گوندی سەدوبیست دەدات لەکاتی نوێژی جەماعەتی بەیانیان دەستڕێژ لەنوێژکەرەکان دەکەن و ژمارەیەکیان شەهیددەکەن. زرگوێزی گەورە دەدات دوو هاووڵاتی بەم ناوانە شەهید دەکەن؛ قادری شاسوارو مام خواکەرەم. هەروەها مامە حەمەی کەناس لەگەڕەکی سەرشەقام نزیك مزگەوتە زەردەکە

لەماڵەوە سەردەردەهێنێتە دەرەوە تابزانێ تەق و تۆق چییە؟ هەر لەوێدا دەیگرن و بەدەمانچە ریزێك گوللە دەنێن بەگەردنییەوە و لەبەردەم منداڵەکانیدا شەهیدی دەکەن، دواتر لەمزگەوتە زەردەکە دەیشۆن و کفنی دەکەن. خەڵکی گەڕەك دەیانەوێ بیبەن بۆ سەرقەبران، رێگایان پێنادەن و ناچار هەر لەودیوەوە لەگردێکی بچکۆلەی بەردەم ماڵی حاجی فەتاحی جگەرەچی بەخاکی ئەسپێرن. جگەلەوەش وەستا لەتیفی نەقار برای پێشمەرگەی دێرینی ئەیلول خالید رەباتی لای ماڵەکەی خۆیان لەگەڕەکی سەرشەقام گوللەباران دەکرێت. لەبەر خانەقایش حەمەڕوتی سەوزەفرۆش و مەحمودی ئاسنگەریش لەسەر قەبرانی گردی سەیوان شەهید دەکرێن، جگەلەمانە دەیانیتر هەن بێناو و بێسەروشوێن ماونەتەوە.

خوشکە مامۆستایەك بەناوی (ص.ر) بۆی گێڕامەوە وتی؛ لە٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا پشکنین دەستیپێکرد، باوکم سەری کێشایە دەرەوە، بەهەڵەداوان هاتەژوورەوە و کێشای بەئەژنۆیدا وتی؛ الله حافظ، یەکسەر بانگی من و دوو خوشکەی‌ترمی کرد، کەسێ کچی پێگەیشتووبووین، لەناو ماڵی باوکماندا لەبەرئەوەی نەك سەربازە بێئابڕووەکان دەستدرێژیمان بکەنە سەر، باوکم دەستیهێنا بەبنی مەنجەڵە مسەکەماندا، هەموو رەشاییەکەی هەڵسوو لەدەم‌وچاو و گەردنمان، ناشیرینی‌کردین تاکو دیمەنمان دزێو قێزاوی بێت لەو بەڵایە بەدوورین. چەندان ماڵی‌تریش وەك ئێمەیان کردبوو بەخۆشییەوە سەرفرازبووین.

کاك سەردار محەمەد ساڵح گێڕایەوە وتی: ئەم رووداوەم بەچاوی خۆم بینیوە؛ لە ٩ی حوزەیراندا (ناحیەی باوەنوور لەگەرمیان) تووشی سزاو کوشتن و گێچەڵ بوو بەپلانی ناڕەوایی (تەها جەواد شەکرچی)، سەدان کەس دەربەردەربوون، دەیانیش شەهیدکران، مەلا مستەفا ناوێك لەگەڵ خزمەکانیدا دەدەنە شاخ لەوێ حەسەنە شوان دەنێرێتەوە بۆ باوەنوور تاکو هەندێ نانیان

فریابخات، کاتێك حەسەن دێتەوە ماڵەوەو بەپەلە بەرەو شاخ دەگەڕێتەوە زۆر دوورناکەوێتەوە تەها شەکرچی و تاقمەکەی دەیگرن، پێی‌دەڵێن؛ ئەم نانەت بۆ کێیە؟، ئەویش دڵی پاکەو دەڵێت: دەیبەم بۆ مەلا مستەفا، یەکسەر رای ئەوەستێنن و گوللەبارانی دەکەن. حەسەنە شوان بەبێ‌هاوارکردن لەجێی خۆی دەکەوێت، خەڵکەکە دەیبەنەوەو دەینێژن.

بەنسبەت شاری هەڵەبجەو دەوروبەریەوە لەدوای رۆژانی تاڵی نوێی حوزەیرانەوە تا ناوەڕاستی مانگی تەمووز ئاگرباران بڵێسە دەدات. زۆرداری ئەو رۆژگارە زەعیم سدیق بەکوشتارەکەی سلێمانی تێری نەخواردو بەخۆی‌و سوپاکەیەوە روودەکاتە شارەزوور. درێژە بەتاوانەکانی دەدات کاروانی قوربانیدان سنگ بۆ شەبەق دەکاتەوە. لەم رووەوە جێگای سوپاس‌و پێزانینە مامۆستایەکی هاوڕێم دوو پێشمەرگەی دێرینی ماندوونەناسی هەردوو شۆڕشی ئەیلول‌و شۆڕشی نوێی پێناساندم کەئەم خەمخۆرو بیرتیژەبوون. عەلی ئەورەحمان قادر ئیناخی ناسراو بەعەلی پەرلەمان‌و شێخ حەسەنی عەبابەیلی‌یی. ئەم دوو زاتە دڵیان گەنجینەی ئەو زانیارییانەبوو. ئەوەی لەیادیان‌و دیبویان پێیان وتم؛ سوپای بەعسی ئەو سەردەمە چی خەڵەو خەرمان‌و دانەوێڵە بوو سوتاندیان. وەکو سەگی هار بەربوونە گیانی هاوولاتیان‌و جۆگەلەی خوێنیان دروستکرد. هێزی پێشمەرگە بەرەنگاریان بوونەوە، بۆماوەی چەند رۆژێك لەسەر پردەکەی زەڵم شەڕێکی سەخت روودەدات. دوژمن شەلم کویرم ناپارێزم دەستدەوەشێنێت. پێشمەرگەی بازوپۆڵاو بەجەرگ حەمە گوڵپی باوکی دکتۆر فایەق گوڵپی گەورەترین داستان دەخوڵقێنێ. فیشەکی پێ‌نامێنێ وەکو شێر لەسەنگەر دێتەدەرێ‌و خەنجەرەکەی هەڵدەکێشێ‌و دەچێتە سەردەبابەکەو دەیەوێت سەرنشینەکانی بەسزای گەل‌و شۆڕش بگەیەنێ بەداخەوە دەکەوێتە بەر دەستڕێژی دەبابەکەی دواوەو شەهیددەکرێت‌و بۆ چاوترساندنی خەڵك تەرمەکەی بەدوای دەبابەدا

رادەکێشن. لەڕۆژی (١٩٦٣/٧/١٤) شەش پێشمەرگەی‌تر لەهەمان شوێن شەهید دەکرێن ئەمە ناوی پێنجیانە؛ عەلی ئەحمەد هەڵەبجەیی، سایێری حەمە حەسەن هەڵەبجەیی، مام ئەمینی دەرگاشێخانی، عینایەتی ئەحمەد بۆینی، عەلی حەمە ئەمین قادر کۆساوایی.. (حەمە عەلی‌و عینایەت‌و مام ئەمین) بەپشتێنەکانی خۆیان بەیەکەوە بەسترابوونەوە. دەبابە شێلاندنی‌و ئەنجن ئەنجنی کردن. دوابەدوای ئەمانە عومەری حاجی سەعیدی ناسراو بەعومەری بۆیاخچی لەناوچەی نەورۆلی کادیربوو. تەقەیان لێکردو باڵێکی شکا بەبریندارى گرتیان ئەو هەر پێی‌دەوتن ئێوە داگیرکەرو فاشیستن ئیدی هەر بەزیندوویی پەل پەلیان کرد. مەلا عابید محەمەد سۆفی دەڵەمەڕی پێشمەرگەی گیان لەسەر دەست تادوا تنۆکی خوێن کۆڵی نەدا تف‌و نەفرەتی لێکردن ئەوانیش لەبەردەرکی سەرای هەڵەبجەدا رەمییان کرد. مەلا رەئوفی برای کەپارێزەربوو راپێچکرا وتیان؛ ئینکاری لێبکەو بڵێ مەلا عابید موخەریبەو هیچم نییە وازت لێدێنین. مەلا رەئوفیش بەدیار چاوی گشتەوە وتی؛ ئەو شەهیدە برامە، برامە، برامە..!! ئیدی بەشێوەیەکی دڕندانە ئازاریان داو دەستڕێژیان لێکرد.

کەریمی یونس ئیناخی لەگەڕەکی جولەکانی هەڵەبجە شەهیدیان کردو لاشەکەیان شێواندو نەیان دایەوە دەست خاوەنەکەی. لەدرێژەی ئەو مەرگ بارانەدا ئەم گیانانەیش بەرەو بەهەشت فڕین؛ عەلی مەلا عەباسی خانەقینی، حاجی عەبدولڕەحیمی عەولك زمناكۆیی، لەگوندی پیرکی ناوچەی شەمێران. حەمە ئەمین مەحمودو حاجی عەبدولڕەحیم شەهید دەکرێن‌و دەکەونە بەر دەستڕێژی فڕۆکەکانی بەعسەوە. دووبرا خەڵکی زەلەکێ، لای عەبابەیلێ بوون بەناوی عەبدوڵڵا محەمەدو حەسەن محەمەد بەقەسفی تۆپی لەشکری تاریکی بەعس شەهید دەکرێن. جگە لەمانەیش چەندانی‌تر ماون‌و بێناون‌و سەر ژمێرنەکراون. چونکە شوێنێکی کوردستان نەما بەر چەپۆکی شەڕی

داگیرکەران نەکەوتبێ. هەر لەو رۆژانەدا رژێم بەتۆپ لەخورماڵەوە ناحیەی بیارەی داگرتەوە لەئەنجامدا دوو هاوولاتی بەناوەکانی فەرەجی دارتاش‌و فەتاحی مەجید بەگ شەهید کران.

شەپۆلی خوێنڕشتن بەرەو پشدەر رۆیشت، زەعیم سدیق لەگەڵ وەکیلە چاوسوورەکەیدا (غانم أمین المصباح–مساعد امر لواو) بەهێزێکی سوپاوە دەگەنە ناحیەی چوارقورنە بەزۆرەملێ کۆمەڵێك خەڵکی بێدیفاع لەپیاوو ژن کۆدەکەنەوەو لەبەرچاوی هەمووان رەمیان دەکەن.

بێگومان تارمایی ۹ی حوزەیرانی ۱۹٦۳ پڕیبوو لەکارەساتی دڵتەزێن‌و دیاردەی خەمناك وەك کوێرەوەری‌و گرانی‌و سوتاندنی هەزاران وێنەی گەش‌و دەستنووس‌و کتێب‌و گۆڤارو رۆژنامەی بایەخدارو لەدەستدانی کەلوپەلی کەلەپووری هەمەڕەنگ، ئەمانە لەخۆیاندا زیانێکیتری کوشندەبوون لەگەل[٤].

گەرچی چاوی میللەتی پێ نەشکا، ئاگری شۆڕش پتر کڵپەی سەند، ئەو زاڵمانی بەعس بەدەستی زاڵمێکیتر کەعەبدولسەلام محەمەد عارف بوو جەزرەبەیان چەشت‌و دوورخرانەوە، بەلام سەردەمەکە هەر بەتاریکی مایەوە، لە۱۷ی تەمموزی ۱۹٦۸دا چنگەڕەشەکانی خۆیان لەجەستەی گەلانی عیراق بەگشتی‌و گەلی کورد بەتایبەتی گیرکردەوە تاپێکەوتنی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰.

بەداخەوە لەماوەی ئەو چوارساڵە پشووەدا لا لەکارەساتەکەی ۹ی حوزەیرانی ۱۹٦۳نەکرایەوە، دەبوایە کتێبی وێنەداری سەربەخۆی لەسەردابنرایە. چونکە دەیان کەس کەوتنە ژێرباری سزاو شەهیدبوون، تەنانەت بەئیدانەو جوێندانێکی ئاسایی بەسەرکردایەتی ئەو دەمەی شۆڕشی ئەیلول رزگاریان دەبوو رەتیان کردەوەو دڵی داگیرکەرانیان بۆساتە وەختێکیش خۆش نەکرد.

شکۆداربێت یادی شەهیدانی نۆی حوزەیرانی ۱۹٦۳و رەونەقدارتر بێت دەستکەوتەکانی راپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱، هاتنەدی خەونی شەهیدان‌و دڵسۆزانی رێگای کوردایەتی رەسەن.

## پەراوێز:

١-بڕوانە نامیلکە شیعری (گەشتێك لەنێوان مەرگ و ژیاندا) پیێزان چاپی ڕۆنیۆ ١٩٩١، لاپەڕە (٦) بڕگەی (کەتنەکەی ١٩٦٣).

٢-قوتابخانەی سەرشەقام مەبەست لەسانەوی جەمهوری ئێستەیە کەدڵڕەقترین ڕەبایەی بەسەرەوەبوو.

٣-هاوڕێ و دراوسێی دێرینم کاك جەبار ئەحمەد مەلا عەلی ناسراو بەجەباری عاسە، وەستاباشی ئاسنگەرە لەدایکبووی ١٩٥٠ لەمەڕ ئەو ڕووداوە تاڵەی ئەو ڕۆژەوە هەندێ شتی‌تری خستەوەبیرم دەربارەی کوشتنی ئەو دووبرایەو مەراسیمی بەخاکسپاردنیان لەمزگەوتی گەڕەکی جولەکانداو خۆیشی ئەو دەم یەکێك بوو لەهەڵکەندەرانی گۆڕەکانیان. هەروەها کاك جەبار دەیوت؛ جگە لەحەمە جگەرە بەلێو عەبدولوەهابی برای (کەچەڵ) بەباوکی وتووە؛ دوو گەنجی‌تریشی ئەو ڕۆژە لەو ناوە کوشتووە. گوایە خەڵکی دێی کەنجیرینی شارباژێربوون. هەروەها چەند دۆست و برادەرێکی‌تر کەم و زۆر بۆ ناوهێنانی شەهیدەکان یاریدەیان دام کەئەم بەڕێزانەن؛ عەلی حەبێ، سەعید ڕەحمان ئاغا، عوسمانی عەلی نەجار.

دیسان وێنەی عەبدولوەهاب لای کاك جەبار پارێزراوبوو. سوپاسی دەکەم و هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم.

٤-ئەو دەم زۆربەی هاووڵاتیانی دانیشتووی شار ژەم بەژەم زەخیرەو خۆراکیان پاشەکەوت دەکرد، هەرگیز ڕۆژانێکی مەینەتباری وەك (منع التجول)ەکەیان لەخەیاڵدا نەبوو. بۆیە نرخی زەخیرەو سووتەمەنی و کەلوپەل بەرزبووەوە، برسیەتی و نەبوونی و بێکاری و کۆست کەوتن بوون بەتارماییەك بەسەرخەڵکەوە، نرخی گەنم و ئاردو ڕۆن سەرکەوت، تەنانەت نرخی تەنەکەیەك نەوتی سەرمۆر گەیشتە دینارو نیویێك.

# سێ رۆژ لەقاعەی ٣ی حامیەدا
# لەیادی (٩)ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا

**بیرەوەریی: هێمن شاڵی**

*کاکە رۆژی (٩)ی مانگی حوزەیران*
*بانگی خەباتە بۆ سەرکەوتنمان*[1]

دەمەوبەیان، کەهێشتا تاریك‌و روون بوو، بانگەوازی قەدەغەی هاتووچۆ (منع التجول) لەناو شاردا بڵاوبووەوە. ئێمەش گوێمان شلکرد بۆ بانگەوازەکەو چاوەڕوانی نادیاربووین، لەکاتێکدا زۆری پێنەچوو لەدەرگا دراو بەدەنگە دەنگی (افتح الباب) دەرگامان کردەوەو ماڵەکەمان پڕبوو لەسەرباز، داوایان لەباوکم[2] کرد کەخۆی بگۆڕێت‌و لەگەڵیان بڕوات، وتیان وەرە لەگەڵمان چەند پرسیارێکت لێدەکەین‌و دەگەڕێیتەوە!، ئەو رۆیشت‌و ئێمە دەرگامان داخستەوە، ئەوەندەی پێنەچوو دیسانەوە لەدەرگا درایەوە. ئەمجارەیان بەمن‌و کامەرانی[3] برامیان وت پێشمان کەون.. وتمان ئێمە قوتابین‌و تاقیکردنەوەی بەکالۆریمان هەیە وازمان لێبێنن، نەگریانی دایکمان‌و نەهاواری خۆمان هیچ دادی نەداین‌و راپێچیان کردین، کەچووینەدەرەوە سواری زیلێکی سەربازیان کردین، کەخەڵکێکی زۆری تیابوو لەلاوو پیری بەر خانەقایی کەئێمە لەهەموویان منداڵتربووین، لەوانەی کەلەزیلەکەدا بوون (عەبدە ئاغای شاڵی) ئامۆزامان بوو، کەپرسیاری باوکمانی لێکردین، پێمان راگەیاند کەلەپێش ئێمەدا بردویانە وتی هیچ خەم مەخۆن لەگەڵ خۆمدان.

زیل کەوتە ڕێگا بەرەو حامیە[٤] لەجادەی کاوەوە بەرەو سەراو بەرەو مزگەوتی گەرەو لای سینەمای سیروانەوە کۆمەڵێکی سەرباز وەستابوون دەستیان کرد بەجنێودان پێمان و هەندێك دەنکە خورمایان تێگرتین. چووینە ناو (حامیە)ەوە، لەوێدا ڕیزیان کردین پێش ئێمە کۆمەڵێك تریان ڕیزکردبوو لەناویاندا باوکمان-مان بەدی کرد، ئەویش ئێمە دی و زۆر دڵگران بوو، لەڕیزەکەی هاتەدەرەوەو داوای لەئەفسەرەکە کرد کەئێمە منداڵی ئەوین و با لەگەڵ خۆیدا بین ئەویش ڕازی بوو، ئێمە دراینە دەست باوکمان و لەگەڵ سەربازێکدا نێردراینە قاعەی ژمارە (٣) کەبەو شێوەیە ناودەبرا.

هەر کۆمەڵە دەنێردرانە قاعەیەك، لەو قاعانە (ئەستەبلی حەیوانەکان-تەویلە)و بەم شێوەیە خەڵکەکە دابەش دەکرا. ئەو قاعەیە کەکۆنکرێت بوو، پاکو تەمیزتربوو لەوانەی‌تر، کەچووینە ژوورەوە بەخێرهاتنیان کردین و دوو پارچە پەردەی پەنجەرەیان داینێ، لەناو قاعەکەدا چەند کەسێك لەلایەن خەڵکەکەوە دەستنیشان کرابوون بۆ ئاگاداری و ڕێنمایی و پەیوەندی‌کردن لەگەڵ پاسەوانەکاندا، لەوانە خوالێخۆشبووان؛ سەعید ئاغای کەریم خان، جەمال شۆتەر.

گیراوەکان لەهەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵیان تێدابوو، هەر لەفەرمانبەرە گەورەکانی شار، لەحاکم و پزیشك و ئەفسەرە خانەنشینەکان و مامۆستاو کاسبکارەکانەوە تادەگاتە چینی کرێکارو قوتابیانی ناوەندی و ئامادەیی. لەوانەی کەلەبیرمدا ماون و پیاوی خاوەن هەڵوێستی مەردانەو شوێنی دیاریان هەبوو بەرامبەر خوێنڕێژ (زەعیم سدیق مستەفا)، خوالێخۆشبووان زەعیم شێخ مارف شێخ حەمە غەریب و عەقید مەحمود خەفاف و د.جەمال ڕەشیدو خوالێخۆشبووان د.قادر شاڵی و حاکم ئەحمەد حاجی ساڵح قاسم کەڕۆژی دووەم بردیانن، لەپاش سەعاتێك هێنایانەوە هەموو گیانی لەخەڵتانی خوێندابوو، د.جەمال و د.قادر دەرمانیان کرد. هەروەها مامۆستای

خوالێخۆشبوو موسا سەمەد بەڕێوەبەری پەروەردە لەگیراوەکان بوو کەپرسیاری بەکەلۆری پۆلی سێیەمو پێنجەمی ئامادەیی لەئەستۆدابوون، یەکەم کەس بوو کەخواردنی لەدەرەوە بۆهاتە ناو قاعەکەوە. هەر لەڕۆژی یەکەمەوە ناو بەناو سەربازێك دەهاتە ژوورەوەو (لیستی ناو)ی پێبوو دەیخوێندەوە لەو ناوانە؛ کەڕۆژی دوو سێ جار ناویان ئەخوێنرایەوەو مەبەستیان بوون محەمەد ئەحمەد تاها (شاعیری نیشتمانپەروەر کامەران موکری)، د.فوائد جەلال غەریبو پارێزەر جەمال شاڵی لەپڕ یەکێك لەخۆیەوە ئەیوت (ما موجودا)و کابرا ئەڕۆیشت. خەڵکەکە هەندێکیان بەقسەو گاڵتەجاڕی کاتەکەیان دەبردەسەرو هەندێك بەنوێژکردنو هەندێك بەبێ دەنگی، لەگەڵ ئەوەشدا کەلەو ناخۆشیەدا بوون، هیچ ناڕەزاییەك نەبوو، هەموو بەشانازییەوە باسی گرتنەکەی خۆیان دەکرد، یەکەم تاقم کەبەربوون لەشەودابوو، هاتن وتیان پیرو نەخۆشو قوتابی کێ هەیە بێتە پێشەوە بۆ ئازادکردن، زۆر لەپیرەکانو ئێمە مانانیش کەتاقیکردنەوەی بەکەلۆریمان هەبوو چووینە پێشەوە بۆ بەردان.

لەکاتێکدا ئەفسەرەکە پرسیاری دەکرد لەوانەی داوای بەربوونیان دەکرد بەتایبەتی قوتابی، لەوکاتەدا نائب زابتێك بەزابتەکەی وت ئەو قوتابیە چاووت لێهەڵدەتەکێنێت، کابرای ئەفسەر چاووی چووەپشتی سەری کەوتە لێدانی دووبرا کەئەوانیش (کەمالو شەماڵی شێخ جەمال-ی خەزێنەبوون بەحەیزەران کەوتە گیانیان تاتوانی لێیدان، لەپاشا بۆی دەرکەوت کەکەمال خۆی چاووی وایە، لەبەرئەوە ئەوانی لەپێش هەموویاندا خستە لیستی بەرەڵاکانەوە، ئێمەش لەترسی لێدان نەمان ئەوێرا لێی نزیك بینەوە، بەترسو لەرزەوە چووینە بەردەمیو وتمان تاقیکردنەوەمان هەیەو هەویەکەمان پیشاندا، ئێمەش خراینە لیستی بەربوونەوەو ئەو شەوە سواری زیلیان کردینو لەجادەی کاوە ئازادیان کردین، بەترسو لەرزەوە خۆمان کرد بەماڵی

نەنكماندا. سێ رۆژی یەكەم ناخۆشترین رۆژانی ئەو گرتنەبوو بۆ هەموو گیراوەكان، چونكە نەخواردن هەبوو، نە ئاو ، گەرما، ئەرزی رەق. لەسێهەم رۆژدا خواردنێكی پیسیاندا بەخەڵكەكەو هەمووی تووشی سكچوون بوو. بەم شێوەیە هەزاران لەخەڵكی سلێمانی گیراو خرایە بەندیخانەوەو لێیان شەهیدكراو زیندەبەچاڵ كرا.

هەزاران سڵاو بۆ گیانی پاكی شەهیدانی نوێی حوزەیران و هەموو شەهیدانی رێگای رزگاری كوردستان

سڵاوو رێز بۆ خەڵكی قارەمانی شاری سلێمانی خۆڕاگر، كەهەمیشە لەپێشەوەی كاروانی رێگای كوردایەتی بوون.

پەراوێزەكان:

١-ئەم شیعرە خوالێخۆشبوو رەفیق چالاك بەگۆرانی وتوویەتی.

٢-باوكم، محەمەد فەرەج شاڵی.

٣-كامەران؛ دكتۆر كامەرانی برام- ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی.

٤-حامیە، شوێنی پاركی ئێستای ئازادییە.

# پەنجا رۆژ لەزیندانەکەی حامیەی سلێمانیدا

## ئەبوبەکر ئەحمەد عەبدوڵلا

لەپاشنیوەڕۆی ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣داو سەعات ٣,٣٠دا رەشبگیرییەکە گەیشتە گەڕەکی ئێمە لە(سەرچیمەن و سەرکارێز)، کەبنکەیەکی سەربازی لەناکاوو کتوپڕ لەبەر ماڵی کاک مەولودی مەریم بەرامبەر ماڵی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا سەفوەت دامەزرابوو، چەند سەربازێك لەدەرگایان دا، داوایان لەهەمووومان کرد کەبێینەدەرێ، هەموو هاتینە دەرەوە. پاش پرسیارکردن لەناوو کارو پیشەو شوێنیکارکردن، من هەرکە وتم مامۆستام لەهەولێرو شوێنی کارم ئاسکی کەڵەکە لەنزیك موسڵ، کابرای ئەفسەر یەك گۆچانی سرەواندە ملم و وتی؛ "گواد ش جابك من اسکیکلك الی هنا؟ انت پارتی لو شیوعی؟ انت معلم ومتمرد!"

لەوەڵامدا وتم؛ خەڵکی ئەم شارەم و بەپشوو هاتوومەتەوە. ئەفسەرەکە داوای لێکردم کەبەجیا لەخەڵکی دانیشم و بەسەر بازەکانی وت ئەمە دەبرێت بۆ (رەمیکردن). منیش بەجیا لەخەڵکی دانیشتم، کوڕەکەی برام کەئەویش گیرابوو هەر سەیری دەکردم و چاوەکانی پڕبووبوو لەفرمێسك، نزیك سەعات چواری دوای نیوەڕۆ، ئۆتۆمبیلێکی سەربازی هات و خەڵکی کۆکراوە هەروەك ئاژەڵ بەدەم لێدان و پیاکێشان و جنێوی ناشیرینەوە، سەر دەخران بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکان، لەوکاتەدا براگەورەکەم هەلی بەدەستهانی و تێکەڵ بەخەڵکە گیراوەکانی کردمەوە و لەو جیاکردنەوەیە رزگارم بوو. کاتێك بردیانین بۆ ناو حامیەی سلێمانی لەدەرگای سەرەکی لای مزگەوتی کانێسکان لە(باب نقامی)

براینە ژوورەوە، کەکەسانێکی زۆر لەوێ کۆکرابوونەوە. خەڵکانی کاسبکارو مەدەنی بەجیا دەبران بۆ تەویلەی وڵاغەکانی ناو حامیە کەچەند تەویلەیەك بوون لەبەشی خۆرئاوای حامیە، کەدوای ناونووس کردنێکی سەرپێی ئەو خەڵکەی لەفەرمانبەرانی میریبوون جیاکرانەوە. ئێمە کەجیاکرابووینەوە بەلای دوو ریز سەربازدا براین بۆ ناو هۆڵێکی گەورە کەپێدەچوو شوێنی مانەوەی سەربازەکان بووبێت و بۆئەم مەبەستە چۆڵکرابوو، خەڵکانیتر بەناو دوو ریزە سەربازەکەدا کەوەستابوون لەلاوو پیرو منداڵی خوێندکاری قۆناغی ناوەندیو دواناوەندی بەناو ئەو دوو ریزەدا دەبران تائەوسەری ریزەکە کەنزیکەی سەدمەترێك درێژدەبوو، لێیان دەدرا بەشەقو پۆستاڵ، دارو قامچیو بۆکس هەتا دەگەیشتنە ئەوسەری ریزەکە، هەبوو دەکەوت، هەبوو رای دەکرد بەناویاندا بۆئەوەی کەمترین لێدانی بەربکەوێت، ئەمە یەکەم جار بوو کەخەڵکی سادەو بێ تاوان ئەم جۆرە رەفتارەیان لەگەڵدا بکرێت، مەگەر لەفیلمی سینەماییدا دیمەنی وادووبارە بووبێتەوەو بینرا بێ. ئەو شوێنەی فەرمانبەرانیان بۆ دەبرد دەکەوتە بەشی خوارووی حامیە، بەگەیشتنم کۆمەڵێك خەڵکم دی کەپیاوماقوڵانی شارو ناودارانی شاربوون، لەوانە کەلەوەو پێشیش دووربەدوور دەمناسین؛ جەلال حاجی سەعید ئاغا بەڕێوەبەری کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار، جەمیل شەکیب بەڕێوەبەری تەحریراتی پارێزگاو مەحمود خەفاف ئامرحامیەی کۆن زۆرکەسانیتر لەوانەی کەلەدواییدا دەهاتنو لەپاش چاوکردنەوە بۆ ئێوارەیەکی درەنگ بەدیم کردن، ناشیرینکردنی ئەو خەڵکە لەلایەن داگیرکەرانەوە بەڕادەیەك بوو، سەربازەکان بێهۆ بەئارەزوو، سەری یەکێکی وەك جەلال ئاغایان شکاند بوو، کەبەئاشکرا خوێن بەسەروچاویدا هاتبووە خوارێو کز دانیشتبوو پاش جنێو پێدانیشی پێیان وتبوو جەنابت بەڕێوەبەری گشتیی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنارێو لەحکومەت یاخیبووی؟

هەر ئەو شەوە کوپەیەك ئاو لەهۆڵەکەدا بوو، تەواوبوو، ئاوی خواردنەوەش نەما، درەنگانێك بە لەحیمکردنی پەنجەرەکان بەیەك جاری داخران. خەڵکی خاوەن ئەزموونەکان بەمەدا زانییان کەمانەوەمان درێژەدەکێشێ و بەم زووانە کەس بەرنادرێت و بۆ ماوەیەکی درێژ دەمێنینەوە، بۆ رۆژی دووەم گرتن هەر بەردەوام بوو، هەر خەڵکی ناو شاردەگیران و دەترنجانە ناو قاوشەکانەوە، ناو تەویلەکانەوە.

بۆ رۆژی سێیەم (٦/١١) گرتن بەشێوەی دوو رۆژی رابردوو هەر بەردەوام بوو بەڵام لێشاوی گرتنەکە کەم بووەوە. لەماوەی سێ رۆژی یەکەمدا، ئەو قاوشانە کەتایبەت کرابوون بەفەرمانبەران سێ هۆڵی درێژی سی تا چل مەتری دەبوون، خرانە سەریەك و دەرگاکانی نێوانیان رێرەوبوو، سەری لای رۆژئاوای داخراو سەری لای رۆژهەڵاتی کرایەوە، ئاودەستەکانی لاوە نزیك بوو، لەسەرەتادا ئاودەستەکان کراوەبوو، بەڵام بۆ هیلاککردنی ئەو ژمارە گیراوانە، رۆژی چەند ساتێك دەکرانەوە سەرلەبەیانی، چوونە سەرئاو دەست زۆر نارەحەت و گران بوو، کەدەچووینە سەر ئاودەست شپرزەدەکراین، داوات لێدەکرا کەخێرا بێیتەدەرەوە، ئای کەبارودۆخێکی ناشیرین و ناخۆش بوون ژمارەی هەموو گیراوان لەهەموو حامیەدا، کەلەدواییدا زانرا دەچووە نزیکەی (٢٧٠٠) کەس کەبەسەر دوو شوێنی سەرەکیدا دابەش بووبوون، ئەم سێ هۆڵەو لەگەڵ تەویلەکان، باری تەویلەکان زۆر سەخت ترو ناخۆش تربوو، چونکە بنمیچەکەی لەوح بوو، زۆر زوو بەرۆژ گەرم دەبوو، سەرەرای تێترنجاندنی ژمارەیەکی زۆر لەگیراوان گەرمیەکەش و بێئاوو خۆراکی لەولاوە بووەستێ، سەربازەکان زۆر کەرەت هەوڵیان ئەدا کە کەسانێك لەگیراوەکان بەرنە دەرەوەو دوویان خەنەوە لەگیراوەکانی تر، بەئارەزووی خۆیان لێدان و سوکایەتی پێکردن ئەنجام بدەن، بەڵام گیراوەکان بەگشتی رێیان پێنەداون، نەیان هێشتووە کەس ببنەدەرەوە، بگەرێنەوە سەرباری پیسی و شری حاڵی

ئاودەستەکان، سەرەڕای بێئاوی تەنەتاوکردن، تەنیا ڕۆژی یەك جار لەبەیانیاندا ڕێیان ئەدا بەگیراوەکان بچینە سەرئاودەست، من خۆم چەند جار بۆنی جلی پیس و میزاوی ڕەش هەڵگەڕاو کاسی کردووم، پێش هەمووان خۆم لێی بێزاربووبووم، چ جای گیراوەکانی‌تر، ئێستاش لەبەرچاومە یەکێکی بەڕێزی وەك دکتۆر جەمال ڕەشید تەنەکەیەکیان بۆ دانابوو لەسەری دانیشتبوو لەبەر نەخۆشی پشت ئێشەو مل ئێشە بەڵام پاش چەند ڕۆژێکی کەم لەگەڵ خوالێخۆشبووان مەحمود خەفاف و شێخ مارفی شێخ حەمەغەریب و حەمە ساڵح ژاژڵەدا چەند کەسانێکی‌تر دیارنەمان. گوێزرانەوە بۆ شوێنێکی تر.

دوای ڕۆژی سێیەم بۆ شەو درەنگانێك برنجێکی خوسێنراویان بۆ هێنابن، گیراوەکان بەسەریا دابارین، بووبووە کەلەکەتریێ وابەسەر یەکدا کەوتبوون، کاتێك یەکێکیان لەبنەمە ڕادەکێشا و لەژێر ئەوانی‌تر دەردەهێنران، مشتی برنجی خووساوی لەچنگدا بوو، سکچوون زۆر بوو، زۆر کەسیش هەبوون بەشداری ئەو خواردنی برنجە خوساوەیان نەکرد، سکچوونەکە زۆرتر پیرەکانی شپرزەکردبوو، ڕۆژی سێیەم زانرا کەهاتووچۆکردن لەناو شاردا بۆ چەند سەعاتێك ڕێی پێدراوە، تاڕادەیەك دانیشتوانی شار بەیەکیان زانی کەچی ڕوویداوە، دەنگ‌وباسی ناوشار دەگەیشتەوە بەگیراوەکان لەکوشتن و برینداری و جووڵەی سەربازی. زۆر بەنهێنییەوە ئەوانەی کەلەڕێکخستن و پارتە سیاسییەکاندا بوون، پارتی بۆلای پارتی و شیوعی بۆ لای شیوعی، یەکیان بەسەردەکردەوە. لەدەوری یەکتر خڕدەبوونەوە.

ڕۆژی تاقیکردنەوەی خوێندنگاکان، تاقیکردنەوەی گشتی بەکالۆریای قۆناغەکانی خوێندن دەستیپێکرد، خوالێخۆشبوو مەولودی مریەم کە فەرمانبەری پەروەردە بوو، هاتن بردیان بۆ کاروباری تاقیکردنەوەکان، لەدواییدا لەگەڵ ئەو خوێندکارانەی کەتاقیکردنەوەیان هەبوو، تاقیکردنەوەش

ئەنجام نەدرا، هەروا مایەوەو دواخرا، گیراوەکان تادەهات لاواز دەبوون، بێخۆراك، چڵکن و سەرووریش هاتوو، چەند کەسێك بوورانەوە، لەناو ئەوانەدا یەکەم کەس جەمال ناوێك (مامۆستا) کەمنیش بەپێوەوەستابووم، لەبەر پەنجەرەیەکدا بەلادا هاتم و بووین بەدوو کەس، لەئەنجامی ئەوەی زیاتر لە ٧٢سەعات بوو خواردنم نەخواردبوو، پاش هۆشهاتنەوە، مامۆستا شێرکۆی حەمەسەعید ئاغا پارچە هەویرێکی ناو سەمووني پەیدا کردو بۆی هانیم، بەوە تۆزێ وریابوومەوە، بۆ شەوی چوارەم هەریەکەی پارووپەك نانیان داینێ، ئەمان ئەزانی چی لەناویدایە، بەهەڵپەوە خواردمان، لەڕۆژانی دواتردا شۆربای نیسك و ماش دەهات بەڵام نەئەزانرا چۆن دابەش بکرێت لەبەر بێ دەفری، چونکە کەس قاپی پێنەبوو، خۆئەگەر سەموون بوایە یان شۆرباکە دەکرایە ناوی، تا لەڕۆژانی داهاتوودا قتووی سەد گرامی دۆشاو پەنیری کرافت پەیدا کرا، شلەکە دەکرایە ناوی هەریەکە چەند کەوچکێکی چێشت خواردن.

## عەلی بولبل

پیاوێکی شێتۆکەی نەفام و نەزان لەگەڵ ئێمەدا گیرابوو ناوی (عەلی بولبول) بوو، رۆژێك سەربازەکان هانیان بەناو گیراوەکاندا گێڕایان بۆ دەستنیشانکردنی خەڵکی، کەسانێك لەم کارە زۆر بێتاقەت بوون. دەترسان کەئەم کابرایە لەدەمیانەوە بدات و بەڵایەکیان بەسەر بهێنێ، کاتێك عەلی و سەربازەکان گەیشتنە لای مامۆستا کەمالی حەمەی شازەمان، کاك کەمال-یان لەگەڵ خۆیان برد لەسەردەستنیشانکردنی عەلی بولبول، ئەو خەڵکە گیراوە وەکو خۆڵ و دۆی بەسەردا کرابێت وابوو، بۆ شەودرەنگانێك مامۆستا کەمال-یان هێنایەوە، بۆ رۆژی دوایی روونبووەوە کەعەلی بولبول وتبووی من ئەم کابرایەم لەماوەت دیوە، پاش لێکۆڵینەوە لەگەڵ مامۆستا کەمالدا، وتبووی بەڵێ راستە من لەو شوێنە بوومە، چونکە مامۆستام و شوێنی پیشەکەم

لەوێیە، پاش هەوڵێکی زۆر هیچیان لێ هەڵنەکڕانبوو، گەڕانیانەوە بۆ ناو گیراوەکان.

یەکێکی‌تر لەو کەسانەی کەبرابووە دەرەوە بەناوی لێکۆڵینەوەوە، کەئەم چەشنە لێکۆڵینەوانە هەر تەنیا بیانوو بوو بۆ لێدان و ئەشکەنجە ئەویش خوالێخۆشبوو (حاکم ئەحمەدی حاجی ساڵحی قاسم) بوو، باوکی دکتۆر بەرهەم، کاتێك هاتن بیبەنە دەرەوە، زانرا کەبۆ لێدانە برادەران بەناوی خۆکۆکردنەوەوە، چەند پارچە جلێکی‌تریان کردەبەر، شان و ملیان بەخاولی داپۆشی، بەمەبەستی کەمکردنەوەی ئازاری لێدان کەبەدارو بەکێبڵ لێیان دەدان، کەکاك حاکم ئەحمەد هاتەوە ئەم باسەی بۆ هاوڕێیانی وەك دکتۆر قادر شاڵی و عەبدوڵلا شاڵی و حەسەن حسێن و کەسانی‌تر دەگێڕایەوە، باسی ئەزموون و شارەزایی کەسانی دڵسۆزو خاوەن رابردووی پاکی دەکرد، کەچۆن بۆ ئەم جۆرە کارانە وریا و لێهاتوون، دڕەندەیی و بێشەرمی و ستەمکردنی فەرمانڕەوایی ئەو رۆژگارە بەراورد دەکرد، چونکە ئەو یاسازان و یاساناس بوو.

رۆژی ١٤ی تەمموزی ١٩٦٣ داوا لەدانیشتوانی شار کرابوو، لیستی ناوگیراوان لەبەردەرکی سەراو مزگەوتی گەورەو چەند شوێنێکی‌تر هەڵواسرابوو، داواش کرابوو کەڕۆژی ١٤ی تەمموز دەتوانن بچنە حامیەی سلێمانی و مواجەهە چاوپێکەوتنی گیراوەکان بکەن.

گیراوەکانیش لەم بارەیەوە ئاگادارکران، کەخۆیان ئامادەبکەن بۆ چاوپێکەوتنی، کەسانی دنیا دیدەو وریا و خاوەن ئەزموون لەم بارەیەوە، لەناو گیراوەکاندا داوایان لەدۆست و ناسیاوان کرد، کەڕێش بتاشن و تۆزێ دەست بەخۆیاندا بهێنن تاوەکو کەسوکاریان بەم شێوەیە نەیان بینن. تائەوەندەی‌تر ناشادو پەست نەبن، رۆژی ناوبراو ئەو دەشتەی بەردەمی ئێستای جێگای دەزگای خاك و هەتا ناو دیواری ماڵە ئینزیباتەکان پڕبوو بوو

لەژن و پیرو منداڵ کەبۆ ئەم مەبەستە هاتبوون، دیوارێکی گڵی یەك مەتری لەنێوان دەشتەکەو شوێنی گیراوەکاندا هەبوو، دەنگی گریان و هاوارو تەقەی سەربازەکان چ بەتانك چ بەچەکی سووك بەسەریاندا ئەو ناوەی ورژاندبوو، لێدانی سەربازەکان و دەرکردنی هێرشبەران دیمەنێکی زۆر دڵتەزێن و ناسۆری هەبوو، بۆیە گیراوەکان بەنائومێدی گەڕانەوە شوێنی بەندییەکان و وتیان ئێمە چاوپێکەوتنمان ناوێ، ئەمەشیان هەر لەسەر داخوازی خاوەن ئەزموون و گەورە پیاوەکان بوو، ئەو رۆژە بەسەرچوو، لەدواییدا لەسەر بنچینەی گەڕەك، گەڕەك چاوپێکەوتن لەڕۆژانی دواتردا ئەنجام درا.

دوای چاوپێکەوتن (مواجەهە) بەتانی و جلوبەرگ و سابوون و پاکەتی جگەرە گەیشتنە ناو گیراوەکان، هەندێ کەس لەپاکەتی جگەرە، یاری کۆنکەن-یان دامەزراند، پاش ئەوەی سەرە پاکەت دروستکراو لەسەر جگەرە یاری ئەکرا نەك پارە ئەم یارییە لەسەر بەتانی دانیشتن کاتێکی زۆری گیراوەکانی برد، داگیرساندنی جگەرە لەسەرەتادا گەر جگەرەیەك بکەوتایە دەست بەکێ، تەنها مژی یەکەمی بۆ خاوەنەکەی بوو، جگەرە دەستاودەست دەڕۆیشت، تا تەواودەبوو، بەڵام ئێستا و دواتر یاری کاغەزیش لەسەر جگەرەبوو، مانەوە لەچل شەو تێپەڕی، چەند جار کەسانێك بۆ لێکۆڵینەوە لەبەغداوە هێنرابوون، لەگەڵ بەندکراوەکاندا راستی باسەکەیان لادەرکەوتبوو، دەوترا ئەم شەممەیە یان دووشەممەیە هەموو بەردەبن، بەڵام نە شەممە نە دووشەممە بەردان هەر نەبوو، تاوای لێهات گیراوەکان بڕوایان بەقسەکانیان نەما. هەتا گەیشتینە مانگی ئاب هەندێ لەگیراوەکان جیاکرانەوەو بران بۆ شوێنێکیتر، پاش پەنجاو سێ رۆژ دەستە دەستە کەوتنەبەردانی گیراوان، لەماوەی سێ رۆژدا ئۆتۆمبیلی سەربازی دەهێنرا، بەندکراوەکان سواری ئەو ئۆتۆمبیلانە دەکران بەناوشاردا دەگێڕران، هەر نەبوایە لەحامیەو بۆ ناو حەوشی سەرا، دوایپڕکردنەوەی پارچە کاغەزێك کەلەوە دەچوو بروسکەی

پشتگیری بێت لەمیری‌و ناڕەزایی لەجوڵاندنەوەی کوردو سەرۆکایەتییەکەی، دەستکرا بەبەردانی گیراوەکان‌و گەڕانەوەیان بۆ ناو کەسوکاریان. پاش ئەم بەردانە بارودۆخەکەو ڕێگاکان لەپایزی ئەوساڵەدا بەرەو باشتر ئەچوو، شار کەمێك بووژایەوە، پەیوەندی بەشارو شارۆچکەکانی‌ترەوە پەیداکردەوە، پاش دەستەڵات وەرگرتنەوە لەحزبی بەعس، جارێکی‌تر گفتوگۆ لەنێوان جوڵانەوەی کوردو میری دەستی پێکردەوە. واتە دوای کودەتاکەی عەبدولسەلام عارف.

# لاپەڕەیەکی زێڕین و پرشنگداری ژنانی کورد
# لەڕووبەڕووبوونەوەی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا

ئەحمەدی مەلا ئەمین عەبدوڵڵا

لە(٩)ی‌ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا قەدەغەی هاتووچۆ (منع التجول) راگەیەنرا بەشارو دەوروپشتیدا، کەچوار شەوورۆژی خایاند، کەس لەماڵ نەدەهاتە دەرەوەو زۆربەی زۆری پیاوان و گەنجانی شارەکە گیران و لەحامیەی سلێمانی توندکرابوون، دەیان کەس گوللەباران کران و لەدەوروبەری شاردا کوژران. پاش چەند رۆژێك لەبەیانییەوە تا عەسر مۆڵەتی هاتووچۆ هەبوو.

شەوێك لەو شەوانەی حوزەیران لەنیوەشەودا بەدەنگی قیژەو هاوار خەبەرمان بووەوە کەگوێمان گرت لەکۆڵانەکەمان دەنگ و قیژەی ئافرەتان دەهات کەلەجۆرە بەرەنگاربوونەوەیەك دەچوو، ئێمەش ئەو شەوە تا بەیانی خەومان لێنەکەوت لەترسی دایك و خوشکانی گەڕەکی چوارباخ، چونکە دەمانزانی زۆری ماڵەکان نێرینەی تیانەمابوو، هەموویان بەشاخەوەبوون یان زیندانی کرابوون. ماڵەکەی ئێمە لەسەر جادەی گشتی بووین کە ماڵی متەسەڕفمان لێوەدیاربوو لای باخی گشتی دەبابەو سەرباز لەبەردەم ماڵەکەیان دیاربوو، بۆیە دەترسان کەئیشەکەیان دەرکەوێت. بەیانی کەرۆژبووەوەو دوای نانخواردن کەپرسیارمان کرد چەند سەربازێك بەبۆچوونی خۆیان دەیانزانی کە لەماڵەکاندا پیاو نەماوە، هیچ لێپرسینەوەیەکیش نییە لەلایەن رژێمەوە بەو نیازە ویستبوویان دەستدرێژی بکەنە سەرژنان و کچانی گەڕەك، بەڵام دایکان و خوشکانی بەشەرەف مەردانە

بەرەنگاریان ببوونەوەو بەگژیاندا چووبوونەوە، دەنگ و قیژە لەخواو غیرەتی ژنانی کورد بەزیادبێت، هیچ کارەساتێکی خراپ رووی‌نەدا.

ژنان کۆبوونەوەو هاواریان دەکرد کەئێمە ئەم دەستدرێژییانە قبوڵ ناکەین، بۆیە زیاد لە٣٠ژنی گەڕەك عابایان دابەسەرداو بەرەو ماڵی متەسەڕف کەبەندەش لەگەڵ یەك دوو کوڕو کاڵی ئەو رۆژگارەی گەڕەکدا لەگەڵیان چووین کەمتەسەڕف (عبدالرزاق السید محمود) بوو بەڵام نەیانهێشت کەس بچێتە ناو حەوشی سەرای ماڵەکە وتیان خۆمان پێی دەڵێین و پۆلیسێك چووە ژوورەوەو پاش ماوەیەکی کەم زەعیم سدیقی جەللاد کەلای متەسەڕف بوو هاتە دەرەوەو ژنان شالاویان بەرەو ئۆتۆمبیلەکەی برد، شۆفێرەکەی ئەوەندە بەخێرایی لێی‌دەخوڕی عەبای ژنێك بوو بەتایەی ئۆتۆمبێلەکەوە، بەلام شێرەژنانی سلێمانی وازیان نەهێنا بەرەو ئینزیباتخانەی عەسکەری بۆی‌کشان و رۆیشتن بێ‌ئەوەی سڵ لەمەرگ بکەنەوە.

رۆژی دوایی لەگەرمەی نیوەڕۆدا، گوێمان لێبوو کەهاوار دەکرا (خەڵکینە وەرنە دەرەوە) کەدەنگی خوالێخۆشبوو وەستا کەریمی بەننا برای وەستا ئیبراهیمی بەننا بوو، کەچووینەدەرەوە بینیمان ئۆتۆمبیلێکی سەربازی وەستاوەو لەدوایەوە زیلێکی سەربازی، چەند سەربازێك کەسەرو شۆرتی عەسکەرییان پۆشیبوو، لەشی هەموویان جێی لێدانی پێوەبوو. ئەفسەرێك بەپڕوتبەی نەقیب، پیاوێکی سوروسپی قۆز وەستابوو دارێکی بەدەستەوەبوو، لەوەدەچوو هەڵگری بیری چەوتی بەعسییەکان نەبووبێ و نەختێ گیانی بەزەیی و لێپرسینەوەی لەدڵدابووبێ، هەروایش بوو ، تومەز کەئافرەتەکان چووبوونە لای و باسەکەیان بۆ کردبوو. ئەویش پیاوانە سەیری خشتەی واجباتی ئەو شەوەی چوارباخی کردبوو، ئەو چەند سەربازە ئێشکگربوون و هێنابوونی و ناسیبوویانەوە. پاش ئەوەی هەموو سەیرمان کردن ئەو ئەفسەرە بەعەرەبی پێی‌ڕاگەیاندین کەئەو سەربازانە بوون چووبوونە ماڵەکان کەوا

دەستگیرمان کردوون و ئەشکەنجەی زۆرمان داون ئەیانبەین بۆ بەندیخانەی عەسکەری، بەڕاستی دەوری ئەو ئەفسەرە پیاوانە بوو، چونکە گەر لەو رۆژگارە سەختانەدا، گەر لەو کارە چەپڵەش زیاتر بکرایە، بۆیان دەچووەسەر، چونکە بەحسابی داگیرکەران کوردهەموویان (موتەمەرید)ن، سەرو ماڵو شەرەفیان حەلاڵە.

ئەوەی کەلێرەدا باسمکرد لاپەڕەیەکی زێڕین و پرشنگدارە لەمێژووی پڕلەسەروەریی خەباتی ژنانی کورد، کەچۆن پارێزگارییان لەکوردو کوردستان دەکرد، بەهەمان شێوەش بەوپەڕی رووسووری و سەربەزییەوە. پارێزگارییان لەشەرەف و کەرامەتی خۆیان کردووە و دەیکەن.

# با راستییەکان خۆیان بدوێن

## سدیق عەزیز خەراجیانی

لـــەحوزەیرانی ســـاڵی (١٩٦٣)دا کـــەرژێمی داگیرکـــەری بـــەعس لەشکرکێشـــییەکی زۆروزەوەنـــدی کـــردە سەرکوردســـتان بـــۆ کـــاولکردن و ئاوارەکردن و سوتماککردنی شارو گوندەکانی کوردستان و شـاری سـلێمانی بەتایبـەتی، لەپرۆسـەی پشـکنین و گـەڕان بـەدوای ئـەو دەنگـە ناڕەزاییانـەی بەرامبـەر سیاسـەتی نادروست و پڕ لـەرق و قینـەی عـەرەبی شـۆفێنیدا هـەبوو بۆیە بەدڕندەترین شێوەو بەناوشاردا بەبەرچاوی دانیشتوانی بێدیفاعی شارو بۆ دامرکانـەوەی حـەزی خوێنڕشتن لەگـەڵ کۆمـەڵێك لاویـتـردا بەزیندوویـەتی دەیان کەن بەژێر گڵـەوە بەشـۆفڵ زیندەبەچاڵیان دەکـەن. کەشـەهیدان (مـەولود رەشید عـەبدولڕەحمان و ئەحمـەدی مـەلا غـەریب) بوون، بـەڵام ئاشـکرایە رقـی گڕگرتـووی دوژمنـان بەرامبـەر گەلەکـەمان سـنووری بـۆ نـەبوو هەربۆیـە لەپرۆسـەی کـاولکردن و سـووتانی گونـدی خـەراجیاندا ئـەم کـردەوەو تاوانـە دڕندانـەیتریان ئـەنجام دا. ئاگـاداری دانیشـتوانی دێیـان کـرد کەدێیەکە چـۆڵ بکـەن و لـەو شـوێنەی کـەبۆیان دانـابوون کۆببنـەوە، تـا بتوانـن ئـەو بەرنامـە گڵاوەی دایاننـاوە بۆ لـەناوبردنی دانیشـتوانی و کـاولکردنی خـانوو مزگـەوت و تـاڵانکردنی سـەروەت و سـامانیان باشـی جێبـەجێ بکـەن بـەڵام دیـارە هەمیشـە لەوەها کارێکدا گیانی بەرەنگاری و بەگژاچوونەوە لەلای خەڵك بەهێزتردەبێت و گیـان بـەخت کـردن و شـەهیدبوون بەخـەڵات دەزانرێت. لەوکاتـەدا دوو دایکـی دڵسۆزو میهرەبان و خـەمخۆری خۆیـان و خـەڵکی گوندەکە، کەدایکـە خـاوەرو

دایکه شەمسەبوون، کەخاوەنی چەند منداڵێك بوون، ژمارەیەك لەمنداڵەکانیان دوورخستبۆوە، بەڵام بەهەردوو دایکەکە چوار کچی تەمەن لەنێوان (٧-١٥) ساڵان لەماڵەوە مانەوە بەم ناوانە؛ ١-گوڵاڵە عومەرو عائیشە عومەر. ٢-مەحبوبە کەریمو ڕووناك کەریم هێندەبینی دیمەنی دڕەندەکانی داگیرکەرانی کوردستان نالەباربوو ئەم چوار خونچە هەست ناسکەی گوندەکە نەیانتوانی ڕێگەی دەربازبوونو خۆکێشکردن بگرنەبەر بۆ لای جەماوەری کۆکراوەی گوند. بۆیە هەروا مانەوە بەتێڕامانەوە سەیری دیمەنە چەپەڵەکەی دوژمنانیان دەکرد کەچۆن ماڵ بەماڵ خەریکی تاڵانیو دزینی پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی ئەمانو خزمو کەسوکارەکانیان بوونو دواتر ئەم جەلادانە نەوتیان کرد بەسەر ماڵو ماڵی تاڵانکراوی خەڵکی گوندو ئاگریان تێبەردەداو ئەم چوار پەپولە بێتاوانەی ناچاربوون بەمانەوە لەماڵدا لەگەڵ بەردو دارو خانەولانەی بابو باپیریاندا سووتانو چاوەپڕ لەهیواکانیان لێکناو بوونە سووتەمەنی حەزی خوێنڕشتنی داگیرکەرانو لەسەیرکردنی سوتانی ئەم پەپولانەدا دوژمنان خۆشیو هەست بەسەرکەوتن لەچاوی‌پڕ لەدوژمنایەتیاندا مرۆڤایەتی خۆشی دەبینراو گڕی سوێری جەرگی دایە شەمەو دایە خاوەر، ناوچەکەی هێنابووە جۆشی نەفرەتکردن. سەدان هاووڵاتیان گوللەباران کردو چەندین هاووڵاتی‌تریان زیندەبەچاڵ کردو بەشۆفڵ کردیان بەژێر خۆڵەوە بێگوێدانە سەرەتاترین بنەمای ڕێزگرتن لەمرۆڤو سوکایەتییان بەپیرو منداڵو ژنان کردو تابلۆیەکی هێندە قێزەونی تاوانیان ئەنجامدا کەتائێستا لەلوتکەی تاوانەکانی دژی مرۆڤدا ماوەتەوە بەهیچ یاساو بیانوویەك ناتوانن ئەو پەڵە ڕەشەی نێوچەوانیان بسڕنەوە. دیارە نابەرامبەری تواناکان لەڕووی سەربازی ئابووریو هاوکێشە سیاسییەکانی ئەو سەردەمە وایکرد قوربانیەکانی گەلەکەمان زۆر گەورەبێتو ئەمەش هانیدان ڕووبکەنە دێهاتەکانو دەستبکەن بەکاولکردنو سووتان بەتاڵانبردنی سەروەتو سامانی

ئەو گوندانە کەبەپشتو پەنای بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان دەزانرا لەسەرجەم رووەکانەوە بۆ نموونە گوندی خەراجیان کەخاوەنی مێژوویەکی دوورودرێژی قوربانیدانە، لەپێناو هاوکاریکردنو پەیوەستبوون بەشۆڕشو راپەرینەکانەوە بۆیە لەم پرۆسەی کاولکارییەدا دوژمنان رقی خۆیان بەسەردا باران و بەشێوەیەك کەنازانین لەکوێوە دەست بەگێڕانەوەی ئەو رۆژگارە رەشە بکەین. لەیەکێك لەبەیانییەکانی ساڵی ١٩٦٣دا لەگەڵ دەرکەوتنی تروسکایی رۆژدا گوندی خەراجیانیش وەك گوندەکانیتری دەوروبەری شار دانیشتوانیان دەچوون بۆشار بۆیە هەردوو لاوی تازەپێگەیشتووی ژیان لەبیروهۆشیاندا دەیان خەونی رەنگاڵەیی بەدی ئەکراو هیواو ئاواتی گەورەیان ئازادیو پێشکەوتنی نەتەوەکەیان بوو، رێدەکەون بەرەو شار بۆ گۆڕینەوەی کاڵاکانیانو بردنەوەی شتومەکی پێویستی ژیانی رۆژانە بەدەم خەندەو لێکدانەوەی جوانی سروشتو پیرۆزی بیروباوەڕی مرۆڤایەتییەوە دەگەنە قەراغ شار، بەڵام مەخابن کەدوژمنی مرۆڤایەتیو رژێمی کۆنەپەرستی عیراقی لەبۆسەدا دەبێت بۆ دەستگیرکردنی ئەو کەسانەی لەدەرەوەی شاردێن بۆ ناوشار ئەمانیش بێئاگا لەبەرنامەی رژێم بۆ لەناوبردنیان دەکەونە دەست جەلادەکانو هەر لەوێ ئەمە نموونەیەکی بچووکی مێژووی پڕشەرمەزاری جەلادی ئەو هەڵمەتانەیە کەبەزەعیم سدیق ناسرابوو لەناوچەکەدا لەچەندین گوندو شارو شارۆچکە تاوانی گەورەتریان ئەنجامداوە.

# هاوسەری شەهیدێکی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەبارەی مێردەکەیەوە ئەدوێ

ئا: شوان کەریم

لـەڕۆژی ٩ی حوزەیـران ژمارەیـەکی زۆر لەڕۆڵـە نەبـەزەکانی ئـەم شـارە قارەمانـەو دەوروبـەری گوللـەباران کـران و بەوتنـەوەی سـروودی نەبـەزین و کۆڵنەدان چوونە ریزی کاروانی نەمران و بەخوێنی ئاڵ و گەشیان سـەرجەم گەلی کوردیان بەئاگاهێنایەوە بۆ ئازادی ئەمڕۆی کوردستان، بناغەی پتەوی شۆڕشی رزگاریخوازی گەلی کورد بوون.

شێخ عـەولی باباگوڕون و عومـەری حـاجی یونس کـەدوو هـاوڕێی بـەوەفاو لێکدانـەبڕاوبوون لـەکارو کاسـبیدا شـەریك بـوون، دوکـانێکی عـەتارییان بەتەنیشـت مزگـەوتی کانێسـکانەوە هـەبوو بەهـەردووکیان لۆرییـەکی بارهەڵگریشیان هەبوو، دوکانەکەیان بۆ کۆبوونـەوەو چاوپێکـەوتن و وتنـەوەی خوێندنی کوردایەتی تەرخان کردبوو بەلۆرییەکەشیان کەلوپەل و خۆراکیان بۆ شۆڕش دابین دەکرد.

ئەو سـەربازەکوردانەی کەخوازیاری پێشمەرگایەتی دەبوون، شـێخ عـەول بـەپارە مۆڵـەتی سـەربازی بۆیـان دابـین دەکـردو رەوانـەی شـاخی دەکـردن. خوالێخۆشبوو حەمەجان عەزیز کەزۆر هاوڕێی شەهید بوو زۆربەی کاتەکانی لەدوکانەکەی ئەواندا بەسەردەبرد. رۆژێك ٦کەس دەگرێت و لەسەر راسپاردەی شێخ عەول. خوالێخۆشبوو حەمەجان کەلەهێزی ناوخۆدا کارمـەندبوو، بەهۆی پەیوەندییەکانی خۆیەوە توانی هەر شەشیان ئازاد بکات و پاشان بەرەو ناوچە ئازادکراوەکان رەوانەیان بکات.

حەلاوەخانی خێزانی شەهید شێخ عەول، بەم شێوەیە دەستگیرکردنی هاوسەرەکەی بۆ باس کردین، سەربازەکان سەعات ١٠-١١ی پێشنیوەڕۆبوو گەیشتنی ماڵی ئێمەو ژمارەیەکی زۆربوون بێگوێدانە هیچ یاساو عورف و عادەتێك بەپرتاو خۆیان کرد بەژوورداو ئێمە شێخ عەولمان شاردبۆوەو زۆرمان تکاکردو لێیان پاڕاینەوە بەو ئومێدەی بتوانین چەواشەیان بکەین، بەلام زۆر بێ رەحمانە ئەوەی رێگریان بوایە سەریان لەژێر پۆستاڵە رەشەکانیاندا دەبینییەوە، دوای پشکنین (شێخ عەول)یان دۆزییەوەو بۆ دەرەوە راپێچیان کرد لەوکاتەدا کەبەرەو دەرەوەیان دەبرد، ئاورێکی لێم دایەوەو دوامالئاوایی ئامۆژگاری ئامێزێك بوو تائاگام لەمنداڵەکان بێت، ماوەی ٩مانگ هیچ هەواڵێکمان نەبیست بۆ سۆراخ و چنگ کەوتن هەواڵ و دۆزینەوەی گۆڕەکانیان لەگەڵ ژمارەیەك شێرەژنی ئەو سەردەمەی دەرودراوسێی گەڕەکی کانێسکان رۆژانە بەبیانووی چیلکەکۆکردنەوەوە بەدەوری حامیەدا دەسوڕاینەوە، بەلام بێهودەبوو لەشۆفێری تاکە شۆفلی شارەوانی ئەو سەردەمە کەبەکەڕەی بەلەدێ ناسرابوو، پاش گوللەباران کردنیان بەشۆفڵەکە داپۆشیبوون، کەشێخ عەول و عومەری حاجی یوسفی لەنێوان شەهیدەکاندا ناسیبووەو بەهاوڕێکانی راگەیاند بوو، لەپاش تێپەڕبوونی نزیکەی ٩مانگ بەسەر ئەو تاوانە دژ بەمرۆڤایەتییە گۆڕەکان دۆزرانەوە لەلایەن کەسوکارو هاوڕێ و هاوسەنگەرانیانەوە تەرمی پیرۆزیان دەرهێنراو بەهۆی تێکچوون و پووکانەوەی تەرمەکان کەنەدەناسرانەوە. شێخ عەول بەهۆی نمرەی مناڵەکانی کەلەگیرفانی دابوو ناسرایەوە.

شەهید عومەریش بەهۆی ئەوەی لەگۆڕە بەکۆمەڵەکەدا کەوتبووە ژێر شەهیدەکانی ترەوە، لاشەی پیرۆزی زۆرتێك نەچووبوو ناسرایەوە.

ژمارەی شەهیدانی کارەساتی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەشاری سلێمانیدا زۆر لەوە زیاترە کەبەسەر زمانی خەڵکانی شارەوە ئەیگێڕنەوە، کەسانێك ئەڵێن کە ١٧٠کەس و خەڵکێکی تر لەوە بەزیاتر لەقەڵەمی ئەدەن، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا هەموو نەدۆزراونەتەوەو بەسەرنەکراونەتەوە، ئێمە لەم نامیلکەیەدا هەوڵمان داوە کەزۆرترین ژمارەی ئەو شەهیدانە بۆ مێژووی گەلەکەمان تۆماربکەین لەڕێی کەسوکاری ئەوانەوە کەتا ئەمڕۆ بۆ یادی ئەو شەهیدانەیان بەخەم و پەژارەن و ساڵانە یادیان ئەکەنەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆر بەتایبەتی لەو خەڵکی لادێیانە کەبۆ کارو کەسابەت روویان کردبووە شارو شەو لەخان و ئوتێلەکان و لەناو بازاڕو کووچەو کۆڵانەکاندا مابوونەوە، کەنەیانزانیبوو سبەینێ چارەنووسێکی رەشی بۆیان لەکەمیندایە، یان ئەو کەسە غەریبانەی کەبۆ چارەسەری نەخۆشی و بۆ کڕینی پێداویستی ژیان هاتبوونە سلێمانی و ئەوانیش بەهەمان شێوەی کاروانی و کاسبکارانی لادێ بۆ ئەو بەیانییە کەوتنە ئەو کەمینەوەو راپێچکران بۆ شێوی مەرگ و رەنگە تائێستاش کەنزیکەی ٤٠ساڵە، کەسوکاریان بەتەمای گەڕانەوەیان بن، یان بەبزربوون دراونەتە قەڵەم.

بۆیە لێرەدا جێی خۆیەتی کەداوا لەوەزارەتی مافی مرۆڤ و ئاوارەو دەزگای شەهیدانی گەلی کوردستان بەڕادەی یەکەم و هەموو مەڵبەندەکانی (ی.ن.ك)و کۆمیتەکان و بارەگای حزبە کوردستانییەکان و هێزی پێشمەرگەی کوردستان بکەین کەلەمە زیاتر کەمتەرخەم نەبن بۆ دۆزینەوەی ناوی ئەو شەهیدانەی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەسلێمانی و لەناو حامیەکەدا، یان لەدەوروبەری شارو شارەکانی تری کوردستان لەشیوو دۆڵەکاندا گیریان خواردبوو لەلایەن سوپای داگیرکەرو سەربازگەو رەبیە زۆرو زەوەندەکانیانەوە دەستدرێژییان لێکراو شەهیدبوون. چونکە وەك بەڵگەکان و خەڵکی ئەو سەردەمە ئاشکرایان

کردووە، کەهەموو سەربازێکی ئەو سوپایە ئەوپەڕی ئازادبووەو فەرمانی پێدراوە کەهەموو کوردێک، پێشمەرگەیەو کوشتنیان حەڵاڵ و جێی دەستخۆشییەو پاداشتکراون، کەئەمەش بەئاشکرا دەریئەخات کەلەو کورد قڕانەو لەو رەشبگیرییەدا ژمارەی شەهیدانی ٩ی حوزەیران زۆر لەوە زیاترە کەتائەمڕۆ ئێمە ناوەکانیان بەسەر ئەکەینەوە. هەر چۆنێك بێ با لەهەوڵی ئەو دابین کەتۆمارێکی تایبەت بۆ ئەو شەهیدانە پوخت و ئامادە بکەین، بۆ مێژوو، بۆ دۆزینەوەی ناوی گومناوانیان، بۆ سەروەریی کەسوکارەکانیان، بۆ بەڵگەی جینۆسایدی گەلەکەمان کەلە ٤٠ساڵ لەمەوبەر دوژمنان لەم وڵاتە پڕ لەمەینەتەدا دەستیان پێکردووە، کەئێستا بەشێکی ئازادەو دامودەزگاکانی حکومەتی کوردستانی تیادامەزراوە. ئەمەش ئەرکێکە ئەکەوێتە ئەستۆی وەزارەتی مافی مرۆڤ و ئەنفال و ئاوارە، دەزگای شەهیدانی کوردستان، سەنتەرو کۆمەڵەکان بەدوای بەڵگەنامەکانی شەڕی دژ بەکورددا ئەگەڕێن و هەموو لیژنەکانی مافی مرۆڤ و دەزگا ئەهلی و رەسمییەکانی ناو کوردستان و دەرەوەی کوردستان، کەئەو کارەساتەی ٩ی حوزەیران لەساڵی ١٩٦٣ سەرەتا بووە بۆ ئەنفال و قڕکردنی کوردو کۆتاییەکەیشی بەئەنفالەکانی ساڵی هەشتاکانی سەدەی رابردوو بوو.

هەروەها داوا لەوەزارەتی پەروەردەی کوردستان دەکەین، کەکارەسات و قڕکردنی گەلی کورد لە ٩حوزەیرانی ١٩٦٣دا بخاتە کتێبەکانی مێژووە تا قوتابیان خوێندکاران شارەزاو ئاشنا بکات لەجینۆسایدی کوردان، داواش لەدەزگاکانی راگەیاندن لەکوردستاندا دەکەین کەساڵانە ئەو هەموو کارەسات و کوشت وبڕە بگەیەنن بەجەماوەری گەلەکەمان و شتی زۆر لەسەر بڵاوبکەنەوە.

ئەمەش ناوی هەندێك لەشەهیدانی ١٩٦٣/٦/٩کە لەزاری کەسوکارو دۆستان و هاوڕێیان و هەندێ بەڵگەنامەی مێژوویی وەرگیراون کەدیارە ژمارەکە

زۆر لـەوە زیـاترە هیوادارین کـەدەزگا پـەیوەندیدارەکان هـەموو نـاوی ئـەو شەهیدانە بدۆزنەوە:

١-ئەنوەر سەعید دارتاش، مامۆستا-سلێمانی

٢-یاسین محەمەد ساڵح، مامۆستا-سلێمانی

٣-محەمەد حاجی حەمە ساڵح ناسراو بە(حەمەبۆر)، مامۆستا-سلێمانی

٤-ئیسماعیل ئیبراهیم بەلووعەچی، مامۆستا-سلێمانی

٥-حاجی باقی، مامۆستا-سلێمانی

٦-نامیق مستەفا ئاغا کەسایەتی خاوەن موڵك-سلێمانی

٧-عەلی ئاسنگەر-سلێمانی

٨-محەمەد حاجی عەبدولڕەحمان

٩-عەبدوڵلا حاجی ئەوڕەحمان

(برابـوون و لـەماڵی خۆیـاندا گوللـەباران کـران (لـەکتێبی عـالم الکـرد المرعـب)دا نووسـراوە؛ مەحمود عەبدولڕەحمان و کەمال عەبدولڕەحمان).

١٠-شێخ عەبدول بابا گورون

١١-عومەری حاجی یونس

١٢-بابا عەلی، خوێندکار لەخانەی مامۆستایان خەڵکی (پشدەر)

١٣-عوسمانی جۆلا

١٤-نامداری چایچی

١٥-عومەری مینە میتوو

١٦-ڕەحیمی عەینە، قەساب-سلێمانی

١٧-نوری عەریزەنووس

١٨-کەمال محەمەد فەرەج ئەفەندی

١٩-حەمە دەمە

٢٠-ڕەفیق کونجرینی

٢١- ئەحمەد کەریم ناسراو بەئەحە نەوتە

٢٢-لەتیفی نەقار برای خالید ڕەباتی پێشمەرگەی دێرین

٢٣-جەلیلی نانەوا لەگەڵ دایکیدا کە(ناوی نەزانراوە)

٢٤-کەمالی سەروەت کۆیی

٢٥-عەبدول رەشید مەلا ئەحمەد (برای دادوەر فایەق رەشید-داواکاری گشتی).

٢٦-مەجید سەعید خەڵکی لادێ

٢٧-حەمە رەشید ئەحمەد حەسەن ناسراو بە (حەمە رەشیدی نەگولان) قەرەتۆغان

٢٨-حەمە گوڵپی-باوکی دکتۆر فایەق گوڵپی، پێشمەرگەی دێرین

٢٩-عەلی ئەحمەد هەڵەبجەیی-پێشمەرگە

٣٠-سابیر حەمە حەسەن-پێشمەرگە

٣١-مام ئەمینی دەرگاشێخانی-پێشمەرگە

٣٢-عینایەت ئەحمەد بوینی-پێشمەرگە

٣٣-عەلی حەمە ئەمین قادر کۆساوایی-پێشمەرگە

٣٤-عومەری حاجی سەعید ناسراو بەعومەری بۆیاخچی

٣٥-مەلا عابید محەمەد سۆفی-پێشمەرگە، هەڵەبجە
برابوون
٣٦-مەلا رەئوف محەمەد سۆفی-پارێزەر، هەڵەبجە

٣٧-کەریم یونس ئیناخی-هاوولاتی، هەڵەبجە

٣٨-عەلی مەلا عەباسی خانەقینی

٣٩-حاجی عەبدولرەحیم عەولك زمناکۆیی

٤٠-حەمە ئەمین مەحمود، گوندی پیرکی، ناوچەی شەمێران

٤١-حاجی عەبدولرەحیم، گوندی پیرکی، ناوچەی شەمێران

٤٢-عەبدوڵڵا محەمەد، گوندی زەلەکی، عەبابەیلێ (برابوون بەبۆردومانی تۆپ
٤٣-حەسەن محەمەد، گوندی زەلەکی، عەبابەیلێ لەو مانگەدا شەهیدبوون)

٤٤-حەسەنە شوان، خەڵکی باوەنوور

٤٥-حەمە ساڵح ئەورەحمان، هەڵەبجەیی

٤٦-مام خواکەرەم، زرگوێزی گەورە (تەمەن ٦٠ساڵ)

٤٧-قادر شاسوار، هاووڵاتی

٤٨-نازم هەڵەبجەیی، پێشمەرگە-هەڵەبجە

٤٩-مەولود رەشید عەبدولڕەحمان-هاووڵاتی، خەراجیان

٥٠-ئەحمەد مەلا غەریب-هاووڵاتی، خەراجیان

٥١-گوڵاڵە عومەر، کچێکی خەراجیانی کەلەناو ماڵەکەیاندا سووتاوە

٥٢-عایشە عومەر ، کچێکی خەراجیانی کەلەناو ماڵەکەیاندا سووتاو (خوشکن)

٥٣-مەحبوبە کەریم، ، کچێکی خەراجیانی کەلەناو ماڵەکەیاندا سووتاو (خوشکن)

٥٤-رووناك کەریم، کچێکی خەراجیانی کەلەناو ماڵەکەیاندا سووتاوە

٥٥-مامە حەمەی کەناس، سەشەقام لەبەرماڵەکەی خۆیدا گوللەباران کرا

٥٦-عەبدوڵڵا ئەحمەد قادر، سەرکارێز-سلێمانی

٥٧-عەبدولڕەحمان حاجی کەریم، کارێزەوشك-سلێمانی

٥٨-عەلی محەمەد ئەمین، هاووڵاتی-سلێمانی

٥٩-شەریف عەزیز فەتاح، هەواری تازە-سلێمانی

٦٠-شەوکەت ئەمین رۆستەم، کانێسکان-سلێمانی

٦١-جەلال عەبدوڵڵا قادر، زەرگەتە-سلێمانی

٦٢-مەحمود حەسەن ساڵح، گردی سەیوان-سلێمانی

٦٣-محەمەد سەعید حەمە ساڵح، چوارباخ-سلێمانی

٦٤-سابیرەکەڕ مەلا ئەورەحمان سیوجگەرچی-سلێمانی

٦٥-غەمناك (عەریزەنووس)-سلێمانی

٦٦-عەبدوڵڵا جۆلا، دێی تۆپ عەسکەر (قۆرەتوو)-خانەقین

٦٧-محەمەد قازی، تۆپ عەسکەر (قۆرەتوو)-خانەقین

٦٨-حەسەن مستەفا-خانەقین

٦٩-حەمەخان، قلیاسان (سلێمانی)

٧٠-غەفووره شێت قلیاسان (سلێمانی)

٧١-رەحیم عەبدوڵڵا-کرێکار لەماڵی حەمەی ئەورەحمان ئاغا، کەچووبووه سەر درەختێکی ئەو ماڵەو لەخوارەوه دەستڕێژێکیان لێکرد، کەوتە خوارەوەو کوژرا. (لەعالم الکرد المرعب-مامۆستا تەها بابان)

٧٢-عەزیز شەریف ئەمین، کوڕەداوێ لەکانی بەردینە

٧٣-ئەحمەدی ئیبراهیم بەگ-سەیدسادق

٧٤-وەستا فەرەجی دارتاش-بیارە

٧٥-فەتاحی مەجید بەگ-بیارە

٧٦-بەکر حەبیب، باخەوان (سەرباز بووەو لەکاتی مۆڵەتدانی لەسلێمانی شەهید کرا).

٧٧-کەمال رەشید حەوێزی، مامۆستای ناوەندی-کۆیە

٧٨-ئیسحاق حەننا، لەبرا مەسیحییەکان-کۆیە

٧٩-شەفیق هۆمەر، چایچی-کۆیە

٨٠-سلێمان حەمەقاوەچی-کۆیە

٨١-محەمەد وەهاب ئاغا، کاسب-کۆیە

٨٢-حەمەد ئەمین ئەحمەد ئاغا، مامی کاك ئارام ساڵح، پەیامنێری کوردستانی نوێ لەکۆیە-کۆیە

٨٣-والی نانەوا-سلێمانی

٨٤-لطفیة (کچێکی پەرستار بوو، لەخەستەخانەی سەرشەقام، لەگەڕەکی خەبات دەستڕێژی لێکرا).

*ئەم شەهیدانەی کۆیە لەناوەڕاستی بازاڕی کۆیەدا بەپایەکانی ناوبازاڕدا بەسترابوونەوەو لەلایەن ئەفسەری تاوانبار (طه جواد الشکرچي) فەرمانی

گوللـەبارانیان درا. (ئـەم زانیارییانـە لەئارشـیفی مامۆسـتا غـەفوور ئەمینـەوە وەرگیراوە).

ئـەم ناوانـە، برایان غـەفوور ئـەمین، ئەحمـەد حسـێن، شـێخ تالیب شـێخ عـەلی بەشوێنیدا گـەڕاون و سـاغیانکردوونەتەوە، هـەروەها کـەڵك لـەو نووسـینانەش وەرگـیراوە کەلــەم نامیلکەیــەدا بڵاوکراونەتــەوە، کــەبێگومان ئــەوانیش لەکەسـوکاری شــەهیدان یــان کەسـانێکی شـارەزاوە وەریـانگرتوون، دیــارە چــەندین نــاویش لەمەوبــەر لەبەڵگــە مێژوویـیــەکانی ٤٠ســاڵ لەمەوبــەر ئاشـکراکراون، بەتایبـەتی شـەهیدانی خـەڵکی سـلێمانی دیـارە لەشـارەکانی کەرکوك، هەولێر، کۆیـە، رانیـە، چەمچەماڵ دەیان شـەهید لـەو رۆژەدا رەشـەدا گیانیان سپاردووە بـەڵام بەداخـەوە لـەم نامیلکەیـەی ئێمـەدا نەنووسـراون، داوا لەبرایانی ئاگادارو شارەزای ئەو شوێنانە ئەکەین کەلەهـەر بوارێکدا بـێ نـاوی ئـەو شـەهیدانە تۆمـارو بڵاویکەنـەوە. دیارە ئەمـە بەشـێکە لـەناوی شـەهیدانی مـانگی حوزەیرانـی ١٩٦٣ کەرەنگـە نیوەی ژمـارە راسـتییەکەی ئـەو شـەهیدانە بن، نەك هەموو شەهیدەکان.

# ناوی ئەندامەکانی ( محكمة الوادي )

# ناسراو بە( شیوی مەرگ )

لەمێژوودا باس لەستەمو زوڵمو زەبروزەنگی چەندین بەناو دادگا کراوە، هەر لە(دادگاکانی تەفتیشەوە)، هەتا دادگاکانی چاخە تاریکەکانو دادگاکانی دارستانو هەموو ئەو زوڵمو زۆرانەی کەبەرامبەر بەشەریەت کراوە، رەنگە ئەگەر بەپێی زەمانو زەمینە، بەراوردێکی ئەو مەحکەمە بەدناوانە بکرێت لەگەڵ بەناو (محکمە الوادی)دا ئەوا تای تەرازووی ئەم دادگایە زۆر قورستربێ لەگەڵ ئەم مەحکەمە هەر بەدناوو دیکتاتۆریو دوژمن بەکوردەدا، کەحەق وایە لەمڕۆدا بەدوای ئەو تاوانبارانەدا بگەڕێینو ناوونیشانیان بدۆزنەوەو بەڵگەکانیان لەسەر کۆبکرێتەوەو لەڕێی لیژنەکانی مافی مرۆڤی کوردو عیراقو جیهانییەوە بەتاوانباری جەنگیان دەستنیشان بکەنو هەوڵبدرێ کەبدرێن بەدادگای نێودەوڵەتی بۆ تاوانەکانی جەنگ لەلاهای.

ئەمەش ناوی هەندێ لەئەندامانی ئەو بەناو مەحکەمەیەیە، کەبە (محکمە الوادی) لەمێژووی گەلەکەماندا ناسراوە:

١-الزعيم صديق مصطفى، آمر لواء العشرون في الجيش العراقي-رئيساً

٢-الحاج عبدالرزاق محمود-متصرف لواء السليمانية-عضواً

٣-المقدم فيصل (من سكنة محافظة ديالة، مدينة بعقوبة)-عضواً

٤-العقيد جاسم (من سكنة بغداد)-عضواً

٥-الطبيب محمد علي حسين-عضواً

ناوی هەندێ لەو ئەفسەرو پلەدارانەی کەلەو رۆژگارەدا دەستیان لەکوشتنو گرتنو ئازاردانی خەڵکی سلێمانیدا هەبووە:

١-الزعيم صديق مصطفى آمر فەرماندەی ليوای بيست لەسوپای عيراقدا- بكوژوبڕ

٢-العقيد طه جواد الشكرچی، بڕوبكوژی ناوچەی هەولێرو كۆيە

٣-العقيد غانم مصباح امين، بڕو بكوژی ناوچەی رانيەو قەڵادزێ

٤-المقدم فيصل- عەسكەری

٥-العقيد جاسم-عەسكەری

٦-نجيب الكشمولة، عەسكەری-ئەفسەر

٧-صبحی، عەريفی عەسكەری

٨-حەميد، عەريفی عەسكەری (ئەمانە حيمايەو ئينزيباتی سەربازیبوون)

٩-ئيسماعيل، عەريفی عەسكەری

١٠-محەمەد، رەئيس عورەفا (ناسراو لەنا خەڵكدا بەحەمە درێژ)، هەروەها نائيب عەريفێكیتر كەلەناو خەڵكيدا بە(كەچەڵ) ناسراوبوو.

ئەمە جگە لەچەندين تاوانباری درەندە

هەر بەرامبەر بەو تاوانە گەورەو لەبن نەهاتووە، هێزی پێشمەرگەی بۆ تۆڵەسەندنەوەی شەهيدانو كوشتو بڕو قەلاچۆكردنی كوردان، ويستيان بەسزای گەلو شۆڕشی بگەيەنن، چەند پێشمەرگەيەكی ناوشار لەسەربانی مزگەوتی گەورەی سلێمانی بۆی دانيشتنو لەسەرجادەی كانێسكان-حاميەی سلێمانی، ئۆتۆمبيلەكەی زەعيم صديق-يان دايە بەردەستڕێژی گوللە، بەڵام لەبەرئەوەی چەكەكانيان لەو جۆرە چەكانە نەبوون كەلەچالاكييەكی لەو جۆرەدا بەكاربهێنرێ بۆيە نەتوانرا كەئەو تاوانبارە بەسزای گەلو شۆڕش بگەيەنرێ.

جگە لەمەش چەند هەوڵێكیتر درا بۆ كوشتنی نەك هەر لەكوردستاندا تەنانەت لەناوشاری بەغدادا، بەڵام هەر بەرنەكەوتو گوايە ئەو تاوانبارە لەم ساڵانەدا لەشاری قاهيرەدا مردووە، پاش ئەوەی تووشی نەخۆشييەكی

درێژخایەنی ببوو، کەنەخۆشی (شەلەل)و چەندین ساڵ بەو نەخۆشییەوە ژان و ئازاری زۆری چەشتووە.

مامۆستا تەها بابان لەو کتێبە بەنرخەیدا کەچەند دانەیەکی لێچاپکردووە، بەناوی (عالم الکرد المرعب) بەزمانی عەرەبی و لەبەشی کارەساتی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا دەڵێ: المحکمه العسکریه المؤقته.. کەمەحکەمەیە کەهیچ مەرجێکی یاسایی تێدانیە وادەردەکەوێ کەئەندامەکانی چەند ئەفسەرێکی گەنجی توندڕەوی بەعسیان بن کەگۆشرا بن بەدوژمنایەتی نەتەوەی کورد.

هەروەها دەڵێ: کەلەو دەستدرێژیی و کوشتن وبڕینەدا (عەبدولڕەحمان عارف (کەلەدواییدا بووە سەرکۆماری عیراق)و سەعید فەتحی الصقلی) بەهەلیکۆپتەر گەیشتنە سلێمانی بۆئەوەی ئەو هەزار (متمرد!) ببینن کەزەعیم صدیق لەسلێمانیدا گرتوونی، ئەوان واهاتن کەئەوانە هەموو گوللەباران بکرێن، بەڵام کاتێ بەناو گیراوەکاندا گەڕان کەژمارەیان لەنێوان ٢٥٠٠ تا ٤٠٠٠کەس بوون و سەرچاوەیەکیش دەڵێ کەژمارەی تەواویان ٣٧٥٤ کەس بوون. کاتێ ڕاستییەکانیان بۆ دەرکەوێ و ئەزانن ئەمانە هەموو کاسبکار، کرێکار، فەقیرو هەژار، مامۆستا، پزیشك، دادوەرو خوێندکارن و کەسیان (متمرد-پێشمەرگە) نین فەرمان دەدەن بەدەزگا داگیرکەرەکان کەهەموو ئەوانە ئازاد بکرێن و بڕیاریش لەسەر ئەو گوللەبارانانە دەدەن بە(ڕەسمی) کە (المحکمه العسکریه المؤقته-محکمه الوادی) لەوەوبەر گوللەبارانی کردبوون.

هەر مامۆستا بابان لەو کتێبەدا ئەفسەر (عەدنان خیرالله) کەژنبراو خاڵۆزای سەرۆکی ئێستای ڕژێمەو (لەجەنگی عیراق-ئێراندا پۆستی وەزیری بەرگری بوو لەحکومەتی عیراقدا، بەپیلانی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە ساڵی ١٩٨٩ گیانی لەدەستدا)، لەوکاتەدا ئەفسەر بووە بەپلەی (ملازم اول) بەیەکێك لەو ئەفسەرانەی کەچەندین کەسی گوللەباران کردووە، دادەنێت.

کتێبەکەی مامۆستا بابان لەڕووی بەڵگەنامەو ناوەرۆکەوە یەکێکە لەو سەرچاوە چاکانەی کەپشتی بەدەیان ڕووداوی بینراو بەدەیان بەڵگەنامەو دیکۆمێنت بەستووە. دەستخۆشی لێدەکەین، هیواداریـن ژمارەکانی لەبازاڕدا دەستبکەون، چونکە ئێمە لەپاش بەدواداگەڕانێکی زۆر نوسخەیەکمان دەستکەوت، جارێکیتریش دەستخۆشی لێدەکەین.

## ٩ی حوزەیران لەدیوانی شاعیراندا

شاعیران و دڵسۆزانی کورد لەدوای کارەساتە خەتەرناکەکەی ٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣وە چەندین شیعری مقاوەمەو شۆڕشگێڕییان گوتووە، هەرچەندە لەسەردەمانی رژێمی دیکتاتۆرداو لەو ماوە دوورودرێژەدا لەناوەوەو لەژێر مقەستی رەقیبدا نەیاندەتوانی ئەو هەموو گەوهەرە بەنرخانەیان بخەنە بەردەست خوێنەران، مەگەر بەپێچ و پەناو پەردەپۆشی ئەو بەرهەمە شیعرییە جوانانە لەژێر مقەستی رەقیبدا دەربازبکەن، یان پێیان بەجەرگی خۆیاندا بنایەو ئەو بەرهەمانەیان لەرۆژنامە نهێنییەکانی شۆڕشدا بڵاوبکردایەتەوە، کەبەوەش ملیان لەپەتی سێدارە نزیک دەکردەوەو یان ئەگەر چاوە زەقەکانی دەزگا داپڵۆسێنەرەکان ئەو بەرهەمانەیان ببینیایە، ئەوا لەجیاتی جارێک دەیان جار تووشی لێکۆڵینەوەی ئەو دەزگا کوژەرانە دەبوونەوە، بۆیە لەوانەیە چەندین شیعری جوان و بەرز لەسەر ئەو کارەساتە گوترابێ، بەڵام بواری چەندین ساڵەی ئەو رۆژگارە سەختانە لەبنمیچ و لەناو چاڵەکاندا دێرەکانیان چۆتەوەو ئەو شیعرە جوانانە جوانەمەرگ بوون.

وا لێرەدا چەندین لەو شیعرە شۆڕشگێڕانە بڵاودەکەینەوە بۆ ئەو کەسانەی کەلەو رۆژگارانەدا بواری خوێندنەوەیان نەدراوە.

## چەند نیگارێکی نوێی حوزەیرانی ١٩٦٣*
## کەلەسەر جەستەی قوربانییەکانی زەعیم سدیق هەڵکەندراون

شێرکۆ بێکەس*

یەکەم:

دەشتێك هەمووی رووتەنی بوو

تەنها لەیەك شوێندا نەبێ

کەتۆپەگوڵ، تۆپە گوڵی گەورە گەورە

داپۆشیبوو.

کەس نەیزانی نەهێنیی ئەم پارچە عەردەو

تۆپە گوڵی گەورە چییە.. هەتاکوو چون

عەردیان هەڵکەند

ئەوسا ئیتر ئاشکرا بوو

کەچەند عاشقێکی فتبۆڵ

لەژێرەوە لەپاڵ رەگی تۆپەگوڵدا

راکشابوون!

دووەم:

ئازادیی سکاڵای خۆی هەیە.

قوربانیی سکاڵای خۆی هەیە.

چیایش هەر سکاڵای خۆی هەیە.

گۆڕستانی مۆمەکانیش هەر سکاڵای خۆیان هەیە

هەموویشیان گەر بیانەوێ

سکاڵایان شۆخو شەنگ بێ

سکاڵایان رازاوە بێ

بەچرای وشەی سەوزو سوور

رووئەکەنە تاقە کەسێ

سکاڵایان بۆ بنووسێ:

عەرزو حاڵچیەکەی بەر سەرا

ئەو پەخشانەی

کەبەپێوە وەکوو فوارە

شەهید کرا!

*سێیەم:*

حەوشەی ماڵەکانی ئێمە

جگە لەچیمەن بۆ قسەو نانخواردنو

دانیشتنو پاڵکەوتنو لەدایك بوونو

نووستنو شووکردنو ژن هێنانیش..هتد

حەوشەی ماڵمان..

زەعیم صدیق.. جەنەراڵی هاوینی مەرگ

بۆ یەکەمجار.. یەکەم کەس بوو

بۆیشی کردین

بەقەبرستان!

*چوارەم:*

مامۆستایانو حوزەیران

وەکو رووبارو سەرچاوەن.
دەنگیان یەکەو لەشیان یەکە
مامۆستایان لەم یادەدا
پۆلی بالندەی وشەن و
حوزەیرانیش تەختەی رەشە!
حوزەیران بەگەرمای مەراق و بەقرچەی ئەو هەموو
کۆستانە، ئارامتی وەك پۆری ناو گرە پرووکان.
تۆ ئێستە وەك تەلی درکاویی چواردەوری زیندانت
داخ بوویت و بەوێنەی خەرمانی سووتاوی مێژووت و
بەوێنەی بازنەی ئاگری ئەو پووش و پەلاشەی شەوانە
لەکەژدا ئەرۆن و ئەسووتێن، کەوتوویتە هەلقرچان.
حوزەیران جەستەتی هاویشتە ناو گەرووی کلپەوە
سەرت بوو بەسەری شاپلیتەو
دەستت بوو بەحۆگەی پەنگرو
ملیشت بەگرِدان
حوزەیران بەهارتی خەلتانی درِك کرد
(ئەو درکە رسکانی گولت بوو)
حوزەیران تۆی دایە بەر تیغی وەیشوومە
(ئەو تیغە هەتوانی زامت بوو)
حوزەیران چەند شەتل و چەند تۆوی گریانی
لەسنگتا شاردەوە.
(ئەو شەتل و تۆوانە کۆگەرانەی ژانت بوون)

حوزەیران پاڵێکی پێوەنای بۆ کەندو هەڵدێری
(ئەو کەندو هەڵدێرە لووتکە بوون بەرەو ژوور)
جەنەراڵ صدیقی هاوینی مردنیش
چەند پەتی بۆ ملی هۆنراوەت هەڵخستو
چەند چاڵی لەپشتی وشەتا هەڵکەندو
چەند کونی کردە ناو دیواری سەرتەوە
پەتەکان.. پلیکەی سروود بوون بەرەو ژوور
چاڵەکان.. دێراوی رستەبوون بۆ چیرۆك بۆ دوارۆژ
کونەکان.. پەنجەرەی سەهۆڵی کۆنگرەی ئەوینی
خەڵکی بوون
حوزەیران.. بەقفڵی قەدەغەی هاتووچۆ
چۆنیەتی خولقانی کلیلی فێرکردی
حوزەیران.. بەدۆزەخ ئاماژەی بەهەشتی بۆ کردی.
حوزەیران.. بەسووتان سەوزایی لەگیانندا هەڵکردی.

*خاچو مارو رۆژژمێری شاعیرێ، شێرکۆ بێکەس، لاپەڕە ١٤٩-١٥٤

## ئەی شارەکەم سلێمانی

کامەران موکری*

خونچەی بزەی لێوی ساوا

لەدڵۆپی ئەشکی چاوا
لەبێخی دڵی ناسکا
توایەوە وەك خوێن تکا
لەسەر سنگی کچۆڵەو ژن
بەخوێن نووسرا ئەمان کوژن
کورپە بەدایکا هەڵزنا
خەم بەدڵی وەك ئاسنا
بەیان کاتی خۆرهەڵاتن
هەڵیکرد رەشەبای مردن
بەخرمەی ئەستێرەی دۆشکا
گەڵێ دڵ وەك شووشە شکا
سلێمانی شاری خەم چێژ
راهاتووی کوشتارو دەستڕێژ
سلێمانییەکەی بەرگەگر
یەکسەر هەمووی بوو بەئاگر
تانكو زرێپۆش، تۆپی مەزن
بانگیان ئەکرد ئەبێ بمرن
دوژمنی ئابڕوو تکاو
برپڕەی مەردێتی شکاو
لەناو شارا بەبێ وچان
تۆوی ترسو مەرگی ئەچان
پشکۆی سامو خەمو سزا

بەپەنجەی ژینا ئەچزا

ماچی خوێناوی دایكو كوڕ

لەشەقاما ئەبوو بەگڕ

سوپای ساواو بێ چەك كوشتن

قەدەغەی كرد تەرم ناشتن

لاشەی كوڕ لەكۆشی دایکا

پێڵووی سووری پیا ئەلکا

رۆڵەكانی کورد بانگیان کرد

ئەژی ئەو کەسەی ئەمڕۆ مرد

کاتێ ئەڕۆن بەرەو سەیوان

بانگ ئەکەن بژی کوردستان

بەقوربانتان بم بزەی دەم

ئەوەکو سامو ترسو خەم

با فوارەی خوێناوی گەش

باخی کورد بگرێتە باوەش

دایك لەگەڵ نەغمەی هەنسك

رای ئەوشان دەسو باسك

ئەیوت: ئەی جگەری پارەم

ئەبی بەگوڵ ئەم بەهارەم

ئەشکت بۆ ئەکەم بەئاورنگ

گڕەی دڵیشم بەگزنگ

سلێمانی شاری دڵتەنگ

بانگی لێ هەڵسا بەیەك دەنگ

وتی: دوژمنی ترسنۆك

رۆڵەی کورد نایەتە سەر چۆك

دوژمنانی ئاوات و رەنج

بانگیان ئەکرد ئەی کوڕی گەنج

یا بەدەستڕێژێك ئەتکوژین

یا بڵێ کورد بمرێ و نەژین

بڵێ: من کورد نیم، کوردستان

ئەکەم بەگۆڕی مەبەستان

وێران بێ کاول بێ خاکم

من کۆیلەیەکی دڵپاکم

وڵاتم چیم هەیە دەگمەن

با پێشکەش بێ بەئەهریمەن

کیژۆڵەی چاو کەژاڵی جوان

هەموو بن بەکەنیزەکتان

نا.. هەزار جار بانگ ئەکەم: نا

دوژمن نیم بەرامبەر کورد، نا

بانگ ئەکەم بەووشەی پەتی

بژی بژی کوردایەتی

ها: ئەوە رووم، دڵم، سنگم

ئەوە بازووم، ئەوە چنگم

پێشکەش بێ بەگوللەی دوژمن

ملکەچکردن نازانم من

من کوردم ئاگری هەستم

گڕ ئەستێنێ بۆ مەبەستم

نابم بەکۆیلەی بێگانە

کەنیزەك نین ئەو کیژانە

لەسەر مشتێ خۆڵی ولات

بێ پەروا گیان ئەکەم خەڵات

نا، هەزار جار بانگ ئەکەم نا

دوژمن نیم بەرامبەر کورد، نا

دوژمنانی خەباتو رەنج

بانگیان ئەکرد ئەی کوڕی گەنج

بانگ کە بڵێ: بمرێ منالّ

هەڵوەرێ گوڵی باخچەی ئالّ

دارزێ پەنجەی هونەروەر

دەك بشکێ ئەژنۆی کورد پەروەر

وێران بێ خاکی شارەکەم

بەپایز بێ بەهارەکەم

نا، هەزار جار، بانگ ئەکەم نا

دوژمن نیم بەرامبەر کورد، نا

لەپێناوی ساوای کورددا

لەرێگەی درشتو وردا

لەسەر گوڵاڵەی خوێن رەنگم

جۆگەی خوڕو گۆمی مەنگم

بەردێکی کەژی وڵاتم

لەسەر ئامانج و ئاواتم

دڵم، ژیانم ئەبەخشم

با بێ بەبڵێسە لەشم

لەلای ئێمە سزاو مردن

پیرۆزە نەك مل کەچکردن

ئەبم بەقوربانی گوڵێ

چاوێ، دەمێ، دەستێ، دڵێ

لەم خاکە بێو هی ئەم خاکە

گیانم لەمردن بێباکە

چاڵێکیان هەڵکەند فراوان

قووڵ وەکو دەروونی تاوان

هەشتا لاوی کوردیان ریز کرد

لەدڵ بەهێزەکانی کورد

براو هاوڕێ، کوڕو باوك

درانە بەر شێلگەی تفەنگ

نرانە چاڵەوە بێدەنگ

خۆڵیان پیاکردن سەرانسەر

تەخت کران بەگرێدەر

پێش مردن هەموویان وتیان:

ئەمرین بەبێ باك بۆ ژیان

برایان چمکی خەم مەگرن

ئێمە ئەمرین ئێوە خۆش بن

ئەی شاری سلێمانی جوان

ماڵئاوا لەتۆ کوردستان

نا، هەزار جار بانگ ئەکەم، نا

دوژمن نیم بەرامبەر کورد نا

لەپێڵوما ژیان نووسی

نابێ بژین بەمەنیوسی

وەرن لەسەر دڵ بنووسین

کەمالو ئەنوەرو یاسین

لەگەڵ کاروانی شەهیدان

بوون بەقوربانی کوردستان

ئەژین لەلاپەڕەی ئالاّ

وەکو گوڵ، لەگەڵ شەمالاّ

لەمەرگی سەختی دوژمنا

لەنرکەی هەڵمەت بردنا

نا، هەزار جار بانگ ئەکەم، نا

دوژمن نیم بەرامبەر کورد، نا

*ڕۆژنامەی برایی، ڕۆژی ١٩٦٨/٤/٢٢

## هەڤالانی شەهیدانم

(بەبۆنـــەی رەشـــبگیرەکەی ٩ی حوزەیـــانی ١٩٦٣وە گوتـــراوە، شـــیعری خوالێخۆشبوو نوری وەشتی، ئاوازو گوتنی؛ خوالێخۆشبوو رەفیق چالاک)

ئەی هەڤالانی رێگای خەباتم

قارەمانانی گەلو ولاتم

ئێوە لاوێ بوون، رووبەرووی دوژمن

بێترس لەراونان، ئازارو کوشتن

هاتنە ژێر ئالای پارتی پێشرەومان*

جەنگان بێ کۆڵدان بۆ کورد، کوردستان

نموونەی لاوی کوردی نەبەزبوون

وەکو بێگەردبوون، ئازابوون، مەردبوون

بەرەو رووی گوللە وەك پۆلا وەستان

تاوەکو دڵتان خرا لەلێدان

ناوتان لەپەرەی دڵ هەڵکەنراوە

لەناو مێژوومان بەخوێن نووسراوە

ئەی هەڤاڵەکان.. ئەی شەهیدەکان

ئەی رۆڵەکانی کوردو کوردستان

ئەو رۆژەی شاری پیرۆزی کوردان

لانەی بابانو جێی قارەمانان

ترسنۆکانە دوژمن وەك باران

بەسەریا گوللەو مەرگی ئەباران

بێبەزەییانە خوێنیان ئەرشتین

بەدڕەندەیی لێیان ئەکوشتین

پەلامارئەدراین.. ماڵ تاڵان ئەکراین

دەستو پێ بەستە بۆ مردن ئەبراین

ئەو رۆژە رەشە.. ئێوە براگیان

لەپارتیو شۆڕش نەبوون پەشیمان

ئێوە دەرتان خست کەئەم میللەتە

بەزینی نییە، ژیانی هەڵمەتە

کاکە رۆژی نۆی مانگی حوزەیران

بانگی خەباتە بۆ سەرکەوتنمان

ئەی دڵسۆزەکان.. قارەمانەکان

جوانە مەرگانی گەلو نیشتمان

ئەو کاتەی نران بەنیشانەوە

بەدەم گوللەوە هەڵئەسانەوە

کەفوارەی خوێنی دەم زامی لەشتان

ئەینووسی بژی کوردو کوردستان

جەستە دابێژراو لەخوێنا گەوزابوو

ئێسك شکێنراو مێشك پژێنراو

ئەو کاتەی ئێوەی بەرزو قارەمان

قوربانی پارتی پێشرەوی کوردان

دەرتان خست کەکورد ئەژی ئەمێنێ

هەقی خوراوی ئەبێ بسێنێ

ئێستاش کاکەگیان سوێند بەپارتیمان

بەشۆڕش، بەکورد، بەکوردستانمان

بەو خوێنەی لەدەم زامتان رژاوە

بەو مێشکەی لەناو خۆڵا پژاوە

بەو گۆڕستانەی دوای گوللەباران

ئێوەی تیا نێژران بێ ناوو نیشان

بەو دایكو باوكەی رۆڵەكەی كوژرا

بەو براو خوشكەی بێبرا كرا

بەو دێهاتانەی بۆمبا دایبێژان

بەو منالآنەی بەزۆر سوتێنران

بەو پێشمەرگانەی کەکوردستانیان

کرد بەگۆڕستان بۆ دوژمنانیان

بەڕووی منالّی ساوای بێتاوان

کەدایکی کوژرا، کەمرد لەبرسان

بەو ئافرەتانەی پەلاماردران

دوای دەستدرێژی بەنێزە کوژران

سوێند بێ بەمانە کەمیللەتی کورد

ئەو کوردەی ئالآی شۆڕشی هەلگرد

لەژێر فەرماندەی پارتی کۆڵنەدەر

ئەو رێیەی گرتی هەر ئەیگرێتەبەر

تاهێزی مەرگی چەپەلّی دوژمن

لەکوردستانا دەرنەپەڕێنن

چونکە ئێمەی کورد دروشمی بەرزمان

(بۆتە کوردستان.. یا نەمانمان)

*وشەی پارتیو پارتی پێشڕەومان، مەبەست لەپارتی دیموکراتی کوردستانە، کەئەو سالانە حزبێکی یەکگرتوو بوو، هێشتانەببوو بەدوو باڵەوە، کەزۆر بەداخەوە دوای ئەو مێژووەی شیعرەکەی تیا گوتراوە بەچەند مانگێك ئەو ڕێکخراوە سیاسییە فراوانە دابەشبوو بەسەر دوو باڵدا، باڵی مەکتەبی سیاسیو باڵی بارزانیدا.

## حوزەیرانم

مارف ناسراو*

حوزەیرانم

دەرگای لەسەر پشتی ژانم

من یادنامەی هەڵکێشراوی

ناو خوێنخانەی ڕۆژەکانم

من خاوەنی سەر ژمارەی

ناوی یەك یەك شەهیدانم..!

گەراو شیلەی دەم پەپوولەی

زامی گەورەو بچووکتانم

تابم ناسن.. من گریانم

من هەنسکی.. منالانی کوردستانم

حوزەیرانم

خۆرم لەناو تەمومژی مانگی هاوینێکی ئالا

هەموو ڕۆژێ بۆیە هەڵدێم لەسەنگەری دێری ساڵا

تاسەرگەمە سەر شەوانی خەست بوونەوەی دێڕەکانت

تادەست گەمە ملی خۆزگەی ئاواتی هۆنراوەکانت

تادەم بنێمە ناو دەمی خوێنی هەڵچووی یادەکانت

تا گڕ بەردەمە فیشاڵی

میوانە بەنگکێشەکانت

کەبەتریاك زامەکانم ئەپێچنەوە..!

وا ئەزانن شاڵاوی دەم ریژگاوکردن

بەری خۆری چاوی ئیستەم دائەپۆشێ

وا ئەزانن وەکو جاران هەموو رۆژێ

حوزمیرانی ئاوارەی من

پێکەنینی لێون ئەبێ..!

وا ئەزانن هەموو رۆژێ

بەسەر تابووتی بێدەنگی خۆما ئەگریم..!

با بزانن کەئەمجارە شمشێری دەنگ

لەبێ دەنگی ئەوەشێنم

میوەی گەنیو لەداری زڕ ئەتەکێنم..!

دیواری خەم.. دیواری زام.. دیواری ترس

ئەڕوخێنم..!

بانگەوازی خۆشەویستی

بەگوێی خەڵکی سەر زەمینا ئەچریکێنم

بابزانن من هۆنراوەی هەستی گڕی شاعیرێکم

پیتەکانی.. پشکۆی داخی گیانی خۆی بێ

وشەکانی.. خەڵتانی خوێنی ئەستۆی بێ
دێڕەکانی.. هەناسەی مافی ئەمڕۆی بێ
با بزانن.. لەدواجارا من یادنامەی تێکۆشانم
من هەنسکی مناڵانی کوردستانم
من پێشمەرگەی دەستەو یەخەی تەفرەدانم..!
حوزەیرانم
حوزەیرانی ناو خوێنخانەی ڕۆژەکانم..!!
ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە (٥٤)
١٩٧٢-بەغدا

## میللەتی بەشخوراو ١٩٦٣

ڕەمزی مەلا مارف

چۆن ئەبێ نەگریم بەحاڵی میللەتێکی بەشخوراو
یا نەناڵێنم لەداخی جەوری دەردی دوابڕاو
شیوەنم بۆچی نەگاتە ئاسمانی حەوتەمین
هەروەکو کوردێکی دایك لەتلەتو کوتکوت کراو
خاکی عالەم بۆ بەسەر تەوقی سەری خۆما نەکەم
چەشنی داماوێکی قەومو قیلە یەکسەر سەربڕاو
خەڵق لەژێر سایەی درەختی سەربەخۆییدا بژی
من لەچۆڵی گەرمی دیلیدا لەبەر قرچەی هەتاو
کێ ئەبینێ غەیری من ئیمڕۆ لەڕووی ئەم ئەرزەدا

وا بەناحەق حەق خوراوو موڵكو میللەت بەشكراو

هەر ئەوەی دوێنێ بەنەوتی ئاشەكەی من هەڵگڕا

ئێستا وا لێم بۆتە ئیستیعمارو خاوەن ئاسیاو

جا لەشاری پەستی بەردەستی لەبەرچی دەرنەچم

نەبمە سەربازێكی یاخیبووی لەكێوكەژ خزاو

تەوقی یەخسیری لەسەر ئەستۆی ژیانم لانەدەم

نەچمە سەر ڕێوشوێنی شێرانی بەسەربەستی ژیاو

تاكو كەی ئەستۆكەچی بەردەستو ئەمری غەیرە بوون

چەشنی خزمەتكارو خوبزەی بەر دەرو عەبدی كڕراو

تاكو كەی ئیتر لەگەڵ هەم خوێنو قەومو قیلەدا

شۆڕو شەڕو، جەنگو جەدەل، وەك دوژمنی باوك كوژراو

شاعیری بەسۆز مامۆستا نەجمەدینی مەلا ڕەسوڵی دێلێژەیی (ن.ئاری) بەقەسیدەی-هۆنراوەكانم- وێنەی ئەو ڕۆژە ڕەشەی ٩ی حوزەیرانمان بۆ دەكێشێ. بەداخەوە كەلەساڵی ١٩٦٨دا دیوانەكەی لەچاپدرا ڕەقابەی میری چەند بەیتێكی كاریگەری لێدەردەكێشن. ئێمەیش لێرەدا بەشێكی لێ بڵاودەكەینەوە:

هۆنراوەكانم هەستی دەروونە

بەری درەختی ڕۆژانی ژینە

پەنگاوی دەروون زۆر لەمەوبەرە

هەمووی ئازارو زۆخی جگەرە

توانایەك نەبوو كەوا بەسرپە

دەردت دەربڕی لای كەس بەچرپە

بۆیە وائێستا بەتاڤگەو لافاو

سەرئەكا بەخوڕ بەكاتو ناكاو

هەروەكو مەلێ تیژ تێئەپەڕێ

دەردی دەروونی وا دەرئەبڕێ

لێم قەدەغە بوو مێژووی ولاتم

كۆتو زنجیر بوو مووچەو بەراتم

چاپخانە بەستراو رۆژنامە نەبوو

بۆ هاورێیەكت رێی نامە نەبوو

لەزنجیرا بوون هەڵكەوتووەكانت

لەسەنگەرا بوون قارەمانانت

كوشتن بوو بەشی راستی بوێژان

خوێنی بێتاوان، نارەوا رێژان

لەخۆر، لەهەوا تۆ بەشدار نەبووی

لەماڵی خۆتا بەرقەرار نەبووی

ئەگەر بۆ پشوو ئەچوویتە سەربان

بۆ گوللە سەرت ئەكرا بەنیشان

رێت لێبەسترا بوو، ئەم ماڵ ئەو ماڵ كەی

ئەبوو هەمیشە خۆت كەڕو لاڵ كەیت

هاوار بەماڵم سامی گرانە

----- ----

ئەگەر رێکەوتو راپێچیان کردی

بەشت هەر شەق بوو یان زللەو قامچی

----- ----

----- ----

----- ----

----- ----

----- ----

----- ----

نەی زانی کەوا کوردی قارەمان

لەهۆلاکۆوە هەتا جەنگیزخان

ئەم هۆزە کەوا فێری نەبەردە

شەهید مامۆستا ئەنوەر سەعید دارتاش

شەهید مامۆستا یاسین محەمەد ساڵح

شەهید مامۆستا محەمەد حاجی ساڵح

(حەمە بۆر)

شەهید مامۆستا ئیسماعیل ئیبراهیم

بەلوعەچی

شەهید عومەر حاجی یونس

شەهید عەبدولعەزیز باباگورون، ناسراو بەشێخ عەولی گورون

شەهید محەمەد عەزیز ناسراو بەحەمە جگەرە بەلێو (٢١ساڵ)

شەهید عەبدولوەهاب عەزیز (١٨ساڵ)

شەهید نامیق ئاغای مستەفا ئاغا

شەهید مامۆستا حاجی باقی

شەهید رەحیم عەینەی قەساب

شەهید حەمە رەشید ئەحمەد حەسەن

لەگولان

تەرمی شەهید مامۆستا ئەنوەر سەعید دارتاش

تەرمی شەهید مامۆستا محەمەد حاجی ساڵح (حەمەبۆر)

لەکاتی هەڵکەندنی گۆڕی شەهیداندا

لەکاتی هەڵکەندنی گۆڕی شەهیداندا

لەكاتی بەخاكسپاردنی تەرمی شەهیداندا

لەکاتی بەخاکسپاردنی تەرمی شەهیداندا

# سوپاس و پێزانین

سوپاسی زۆری هەموو ئەو کەسانە دەکەین کەهاوکارییان کردووین لەئامادەکردنی ئەم کتێبەدا، چ بەنووسینی وتارو بەدواداچوون، یان بەپێدانی زانیاری لەبارەی رووداوەکان و ناوی شەهیداندا، بەتایبەتی مامۆستا غەفوور ئەمین عەبدوڵلا سەرپەرشتیاری پەروەردەیی لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی پەروەردەی سلێمانی، کە لەکاتی هەڵدانەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکانی شەهیدانی نوێی حوزەیرانی ١٩٦٣دا بەکامێرای خۆی چەندین وێنەی تەرم و ئێسك و پروسکی ئەو شەهیدانەی گرتووەو چەندین ساڵە لەئارشیفی نهێنی خۆیدا پاراستوونی، وەك پیاوێکی خەمخۆر ئەو وێنانەی پێشکەش کردووین.

جارێکیتریش سوپاس و پێزانینمان بۆ ئەو برا بەڕێزە دووپات دەکەینەوە.

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی

و ستافی گۆڤاری سلێمانی

# Martyrs Of 9, June 1963
# Some Bloody Papers
# Of Kurdish People Struggle

## 9 ی حوزەیران و سڵاو لەداری ئازادی

دەمەوێت ئەو ڕاستییە دووپات بکەمەوە کەسلێمانی سەرباری ئەوەی قەڵای ڕاستەقینەی خەبات و تێکۆشانی کوردەواری بووە، سەرباری ئەوەی ڕۆڵی کارای پێشڕەویی بوارەکانی شارستانی و مەدەنی بووە، باجی ئەوڕێچکە شکێنییەشی بەقوربانیی گەورە داوەو لەم شارەوە، گۆڕی بەکۆمەڵ و کوشتنی بەکۆمەڵ و قەسابخانەی دوژمنان دروستبووە، نموونەی زۆر دیارو زەقی چەرخی ڕابردوومان،کارەسات و تاوانی گەورەی 9 ی حوزەیرانی 1963یە کەڕۆژێکی تاریک و تەمومژاوییە لەمێژووی شارەکەو کوردیشدا.

9ی حوزەیران تەواو مانای گۆڕو کوشتاری بەکۆمەڵی خەڵکی بێگوناح و ئازادیخوازی کورد بوو، کە لەبەرە بەیانێکی نائاساییدا بوونە قوربانیی و بۆدوای خۆیان داری ئازادییان بەخوێنی گەشیان ئاودا. ئەو دەرس و پەندانەی لە 9ی حوزەیران بۆمان جێما، ئەو ڕاستییەی سەلماندەوە، کەئەم شارە هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی گەورەی دوژمنانداپەو قین و دوژمنایەتی داگیرکەران، لەگەڵ شاری هەڵمەت و قوربانی دێرینە، ئەمەش سەرەڕای قوربانییەکانی کەچەند ساڵی ڕابردوو شاهیدی ئەو حاڵەن ، ئەوشانازیی و سەروەرییەی بۆ سلێمانی تۆمار کردووەو هەمیشە دارولەولکی بابانی بەزیندوویی و گەشەکردوو مەزن هێشتۆتەوە، لەبەرگریی و بەرخودان دژ بەهەموو کارێکی نامرۆڤانەو تیرۆرو تۆقاندن لەپێناو چەسپاندنی دیموکراسیی و یاساو مافی مرۆڤ و ئازادیدا.

حاکم قادر

سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوانیی سلێمانی